ئینستیتوتی بانگخوازان

# سیفاته دەروونیەکانی بانگخواز

منتدى إقرأ الثقافي

www.iqra.ahlamontada.com


نووسینی

عبدالله ناصح علوان

مامۆستای دیراساتی ئیسلامیی لە
زانکۆی مەلیك عەبدولعەزیز لە جەددە


وەرگێڕانی

قاسم سەلام

# سیفاته دەروونیەکانی بانگخواز

نووسینی

عبداللە ناصح علوان

مامۆستای دیراساتی ئیسلامیی لە زانکۆی مەلیک عەبدولعەزیز لە جەددە

وەرگێڕانی

قاسم سەلام

ئینستیتوتی بانگخوازان

# پێشەکی وەرگێڕ

سوپاس و ستاییش بۆ خوای پەروەردگارو، دروودو صەلات و سەلام لەسەر گیانی پێغەمبەری خۆشەویست صلی الله علیه وسلم..

بەندە وەك ئەندامێکی بەشی گەنجانی ئینستتیوتی بانگخوازان لە نووسیگەی هەولێر، بە ئەرکی سەرشانی خۆمم زانی وەك یەکێ لە چالاکیەکانی بەشەکەمان هەڵسم بە وەرگێڕانی ئەم نامیلکەیە، کە پێم وایە لەگەڵ ئەوەی بابەتەکانی زۆر کورت و پوختن، بەلام سوودێکی زۆر دەگەیەنێ بە پشتیوانی خوای کاربەجێ، دەمەوێ ئەوە بڵێم: هەولم داوە زۆر پشت نەبەستم بە وەرگێڕانی دەقاو دەقی وشەکان، چونکە شارەزایانی زمان ئەوە دەزانن کە هەندێ جار بۆ وەرگێڕانی وشەیەکی عەرەبی ڕەنگە پێویستت بەدانانی دوو وشەی کوردی هەبێ لە شوێنیدا، بۆ ئەوەی بتوانی بەچاکی ئەو پەیامەی کە دانەری کتێبەکە دەیەوێ بگەیەنرێ، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکەوە ڕەنگە هەندێ جار هەندێ شت پێویست بەوە نەکا دووبارە بکرێتەوە هەولم داوە ئەگەر لاشی نەبەم زۆر بە کورتی بیهێنم، بۆ کردنە کوردی ئایەتەکانیش پشتم بە (پوختەی تەفسیری قورئان) بەستووە.

لە کۆتاییدا زۆر سوپاسی م. (سیروان کاکە أحمد) دەکەم بەرپرسی بەشی گەنجانی ئینستتیوتی بانگخوازان، کە هەمیشە بۆ ئەم کارەو هەر کارێکی دیکەی دینیی و دونیاییم پاڵپشتێکی بەهێزم بووە، وە دوای وەرگێڕان و ئامادەکردنیشی لەلایەن بەندە، لەگەڵ سەرقاڵی زۆریشی دووبارە زۆر بە وردی پێیدا چۆتەوە، هەم لە ڕووی

وەرگێڕانەوە، هەم لە ڕووی تایپ کردنەوە، خوای پەروەردگار بە باشترین شێوە پاداشتی بداتەوەو دەست بە تەمەنیەوە بگرێ.

داواکارم لە خوای بەخشەرو بەزەیی ئەم کارەو هەر کارێکی دیکەم تەنها بۆ ئەو بێ‌و، چاو لە هەڵەو کەمو کوڕیەکانم بپۆشێ‌و کارەکەم لێ قبوولّ بکات‌و بیکاتە تێشووی دوای مردنم...

قاسم

٢٠١٦/١١/٥

هەولێر

## پێشەکی دانەر

**الحمد لله رب العالمين وافضل الصلاة وأتم التسليم على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين، وعلى دعاة الحق، وقادة الخير بإحسان إلى يوم الدين... وبعد.**

ئەمە کتێبی پێنجەمە لە زنجیرە کتێبەکانی قوتابخانەی بانگخوازان: (مدرسة الدعاة)، لە ژێر ناوو نیشانی سیفاتە دەروونیەکانی بانگخواز، (صفات الداعية النفسية).

پێشکەشی ئێوەی دەکەم "برایانو خوشکانی بانگخواز" بەڵکو ببێتە گەیاندنی بانگەوازی ئیسلام، وە ببێتە هاندانێك لە هەڵگرتنی ئەو پەیامە خواییە بۆ هەموو دونیا، وە خوا لەگەڵ پارێزکارانو چاکەکاراندایە.

## ڕێخۆشکردن

خوشكو برای بانگخوازا پاش ئەوەی گەورەیی ئەم بانگەوازەت زانی بەسەر بانگەوازەکانی دیکە، وە پاش ئەوەی زانیت کە ئەم بانگەوازە پێویستە ڕابگەیەنرێ لە ژیانی ئینسان، وە پاش ئەوەی ڕێزو پێگەی بانگخوازت زانی لای خواو لای خەڵك، ئەمە وات لێ دەکات شتێکی دیکە بە پێویستتر نەزانی لەوەی کە زانیاریت هەبێ دەربارەی ئەو بنچینە دەروونیانەی کە پێویستە لە کەسی بانگخوازدا هەبن، بۆ پێگەیاندنو بنیاتنانی کەسی بانگخواز، وە بۆ ئامادەکردنی زانایان، بۆ ئەوەی پێی وەسف بکرێ، وە خۆی بە چاکترینی ئەو سیفاتە دەروونیانە برازێنێتەوە، بۆ ئەوەی بانگخوازی حەق بێو خەڵك لێی سوودمەند بن، وە خەڵکی بە ڕێنماییەکانی کاریگەر بن، وە بە دەوری گەورەی خۆی هەڵسێ کە بریتیە لە چاکسازییو گۆڕانکاری، وە ڕزگارکردنو ڕێنمویی خەڵكو کۆمەڵگا.

بەڵام ئایا ئەو سیفەتە دەروونیانە چین کە هەرکاتێ بانگخوازان خۆیان پێ ڕازاندەوە ئەوە لە گۆڕەپانەکانی بانگخوازیو تێکۆشانو شەهید بوون هەرگیز سڵ نابنەوەو تووشی بێ تاقەتیو ڕەش بینی نابن؟!!

وای دەبینم کە ئەو بنچینانە لەسەر چەند بناغەیەك ڕێك دەخرێت:

## ئیمان

بە دڵنیاییەوە ئەوە زانراوە کە هەرکاتێ ئیمـان بـە خـوای تـاکو تـەنها چـووە نـاو دەروونی ئینسان، وە لەگەڵ دڵدا تێکەڵ بوو دڵی ئینسـانی پێ کرایەوە، ئەمە یەکەم چەکێکە کە کەسـی بـانگخواز خـۆی پـێ چـەکدار دەکـات بـۆ بەرەنگاربوونـەوەو ململانێ کردن لەگەڵ قۆناغەکانی ژیان بە خۆشیو ناخۆشیەکانیەوە، وە ئەم ئیمانـە یەکەم چەکێکە بەکاری دەهێنێ بۆ سەنگەر گرتن لە دژی فریودەرەکانی دنیا، جا چ ئەگەر هاتوو بانگخواز لە حاڵەتی ژێر دەستەیی دابوو، یاخود ئازاد بوو، لە هێـرش بردندا بێ، یاخود لە بەرگری، لە حاڵەتی سەرکەوتن دابێ یا لە تاقیکردنەوە دابـێ، بەبێ بوونی چەکی ئیمان هەموو چەکەکانی دی پـووچو بـە تـاڵن، وە هـەموو خـۆ ئامادەکردنەکانی دیکە بەتاڵن، وە هەموو زادو زەخیرەیەکی دیکـە پـووچو بەتاڵـە بەبێ بوونی ئیمان.

* **مەبەستمان لە ئیمان ئەوەیـە:** بـانگخواز لـە نـاخی خۆیـدا بـاوەڕی وابـێ کـە ئەجەلەکان بەدەستی خوان، وە ئەوەی تووشی دەبێ لەبـەر ئـەوە نییـە کـە هەڵـەی کردووە، وە ئەوەی هەڵەی لێ دەکات لەبـەر ئـەوە نییـە تووشـی بـووە، وە ئەگـەر هەموو ئوممەت کۆ ببنەوە بۆ ئەوەی سوودێکی پـێ بگەیـەنن نـاتوانن سـوودی پـێ بگەیەنن تەنها مەگەر بەو شتەی کە خوا بۆی نووسیوە، وە بـە پێچـەوانەوە ئەگـەر هەموو کۆببنەوە بۆ ئەوەی زەرەرێکی لێ بدەن ناتوانن ئـەو زەرەرەی پـێ بگەیـەنن تەنها بەو شتە نەبێ کە خوا بۆی نووسیوە.

وە پێویستە ئیماندار هەمیشە چاوی لەسەر ئەو ئایەتـە موبارەکـە بـێ کـە خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿ قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا هُوَ مَوْلَىٰنَا وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ٥١ ﴾ التوبـة. واتە: (ئەی موحەممەد صـلی

الله علیه وسلم) بڵێ: هیچمان تووش نابێ بێجگە لەوەی کە خوا نووسیویەتی بۆمان، خوا پشتیوانی ئێمەیە، وە بڕواداران با تەنها پشت بەخوا ببەستن.

وە هەموو بەیانیانو ئێواران ئەمە بڵێتەوەو، بەبیری خۆی بێنێتەوە کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ ... فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٣٤﴾ ﴾ الأعراف. ئنجا کاتێك ماوەی مردن یان سزاکەیان هات ساتێك دوا ناکەون، وە پێشیش ناخرێن.

بەو باوەڕە، وە بەم هەستە، ئیماندار ڕزگاری دەبێ لە ترسو بیمو بێ جورئەتی، وە خۆی دەڕازێنێتەوە بە صەبر گرتنو ئازایەتیو دەست پێشخەری، لە قوڵایی دڵیەوە هاوار دەکات وەك ئەو هاوار کردنەی پێشەوا عەلی خوا لێی ڕازی بێ کاتێ کە سەنگەری لە دوژمنانی دەگرت دەیگوت:

أيّ يومي من الموت أفرّ ... يوم لا يَقدِر أم يوم قُدِر

يَوم لا يَقدِر لا أرهَبه ... ومنَ المقدور لا يَنجو الحَذَر

چ ڕۆژێکمە لە مردن هەڵبێم؟ ئەو ڕۆژەی قەدەر نەبووە، یاخود قەدەر بووە، ئەگەر قەدەر نەبووبێ (بمرم) هەڵنایەم، خۆ ئەگەر قەدەریش (قەدەری خوا نوسیبێتی بمرم) ئەوا ووریا بوونو ئاگا لە خۆبوون ڕزگارم ناکات (لە مردن).

* **هەروەها مەبەستمان لە ئیمان ئەوەیە:** ئیماندار لە ناخی دڵیەوە باوەڕی وابێ کە ڕزقو ڕۆزییەکان هەمووی بەدەست خوان، وە هەر شتێ کە خوا بیەوێ پێی بدا کەس ناتوانێ ئەو شتەی لێ قەدەغە بکات، وە هەر شتێکی خوا لێی بگرێتەوە لە توانای کەس نییە ئەو شتەی پێ ببەخشێ، وە ئەوەی بۆ تەقدیر کراوە کە دەبێ بیجوێ هەر دەیجوێ، وە هیچ نەفسێك نامرێ تاوەکو ئەو ڕزقو ڕۆزیو ئەجەلەی بۆی دیاری کراوە وەری نەگرێو بەسەری نەبا، وە پێویستە لەسەر ئیماندار کە

چاوەکانی لەسەر ئەو ئایەتە مویارەکە بێ کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ رَبَّكَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا ﴿٣٠﴾ ﴾ الإسراء، واتە: بەڕاستی پەروەردگارت ڕزق‌و ڕۆزی فراوان دەکات بۆ هەر کەسێ بیەوێ‌و، تەنگی دەکات لەسەر هەر کەسێ بیەوێ، بەڕاستی ئەو هەمیشەو ئاگاو بینایە بەبەندەکانی، وە شەوو ڕۆژ ئەو ئایەتە بلێتەوە کە دەفەرموێ: ﴿ أَمَّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى يَرْزُقُكُمْ إِنْ أَمْسَكَ رِزْقَهُۥ ۚ بَل لَّجُّوا۟ فِى عُتُوٍّ وَنُفُورٍ ﴿٢١﴾ ﴾ الملك، واتە: ئایا ئەوە کێیە ئەو کەسەی کە ڕۆزیتان دەدات ئەگەر خوا ڕۆزی خۆیتان لێ بگرێتەوە، بەڵکو (بەئارەزوو) درێژەیاندا بە سەرکێشی‌و دوورکەوتنەوە لە (ڕێی ڕاست)، بەم باوەڕەو بەم هەستە ئیماندار ئازاد دەبێ لە زیادە سووربونی لەبەدەست هێنانی دونیا، وە لە زۆر خۆپچڕینەوەی بۆ داواکردنی دونیا، وە هەروەها ڕزگاری دەبێ لە قرچۆکیی‌و ڕەزیلی دەروونی‌و لە بەخیلی، بە پێچەوانەوە ئەو ئیمانە وای لێ دەکات خۆی بڕازێنێتەوە بە سەخاوەت‌و بەخشین‌و پێشخستنی براکەی بەسەر خۆی، بەڵکو سەعادەتی خۆی لەبوونی قەناعەت‌و بژێویەك دەبینێتەوە بەپێی پێویست، ئەگەر نەفسی ئینسان قەناعەتی بۆ دروست بوو ئەو کات بەکەم ڕازی دەبێ، وە شتێکی سەهل‌و ئاسان بەشی دەکات، ڕەحمەتی خوا لە پێشەوا شافیعی بێ کە دەڵێ:

النفس تجزع أن تكون فقيرة    والفقر خير من غنى يطغيها

وغنى النفوس هو الكفاف فإن أبت    فجميع ما في الأرض لا يكفيها

واتە: نەفس دەترسێ لەوەی هەژار بێ، وە هەژاری باشترە لە دەوڵەمەندیەك بەرەو لە خۆبایی بوونت بەرێ، دەوڵەمەندی نەفس لەوەدایە دەست هەڵگرێ، ئەگەر وای نەکرد، ئەوا هەرچی لە زەوی هەیە پێی بدرێ بەشی ناکاو ناڵێ با بەس بێ.

*** وە هەروەها مەبەستمان لە ئیمان ئەوەیە: کە ئیماندار بە هەموو هەستو** شعوری باوەڕی وابێ کە خوای کاربەجێ لەگەڵی دایە، دەیبینێ دەیبیستێ، وە زانایە بە نهێنیو ئاشکرای، وە زاناو شارەزایە بەو چاوانەی کە بە خیانەتەوە دەڕوانن‌و، وە بەو شتانەی لە دڵدا شاردراونەوە.

وە پێویستە لەسەر ئیماندار چاوی لەسەر ئەو ئایەتە بێ کە خوا سبحانه وتعالى دەفەرموێ: ﴿ مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَآ أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا۟ ۝٧ ﴾المجادلة.

واتە: چپەی هیچ سێ کەسێك نیە کە خوا چوارەمیان نەبێ، وە چپەی هیچ پێنج کەسێك نیە کە ئەو شەشەمیان نەبێت، وە نەکەمتر لەو ژمارە نە زۆرتر نیە مەگەر خوایان لەگەڵدایە بە (زانیاریو ئاگاداری) لە هەر جێگایەکدا بن.

وە بەیانیان‌و ئێواران ئەو ئایەتە دووبارە بکاتەوەو بڵێ: ﴿ وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ ۚ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۚ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ۝٥٩ ﴾الأنعام.

واتە: وە کلیلی هەموو نهێنیەکان لای خوایە، کەس نایانزانێ بێجگە ئەو (خوا) وە خوا دەزانێ چی لە وشکانیو دەریادا هەیە، وە هەر گەڵایەك بکەوێتە خوارەوە خوا پێی دەزانێ، وە هەر دانەوێڵەیەك لە تاریکیەکانی زەویدا بێ، وە هەر تەڕو وشکێك هەبێت هەر هەموویان لە کتێبی پارێزراو (لوح المحفوظ) دان.

ئیماندار بەم باوەڕەو بەم هەستە لە گرێی نەفسو ئارەزوو ڕزگاری دەبێ، وە لە فێڵو تەڵەکەی شەیتان‌و نەفسی فەرمانکەر بە خراپە ڕزگاری دەبێ، وە لە فیتنەی ماڵو ئافرەت ڕزگاری دەبێ، وە دەڕازێتەوە بە هەست کردن بە چاودێری خوا

بەسەریەوە، وە بە نیازپاکی بۆی، وە بە پشت بەستنو داوای یارمەتی کردن لێی، وە ئەو جۆرە ئیمانە دەبێتە پالنەرێك بۆی کە بەو پەڕی دلنیاییو بە هەند وەرگرتنو رێكو پێکی کردەوەکانی ئەنجام بدات.

بەلکو وای لێدێ "کاتێ لەنێو خەلکدا دەڕوات" کەسێکی دادگەرە، چاکەکارە، پارێزکارە، وەك رێحانێکی بۆن خۆشە، لە نێو کۆمەلگادا لە دوورەوە بۆنی خۆشی دەکەنو بەپەنجە ئاماژەی بۆ دەکەن.

دەبێتە کەسێك کە ئەو پارچە شیعرە لە خۆیدا بەرجەستە دەکات کە دەلێ:

إذا ما خلوْتَ، الدّهرَ، يوْماً، فلا تَقُلْ   خَلَوْتَ ولكِنْ قُلْ عَلَيَّ رَقيبُ

ولاَ تَحْسَبَنَّ اللهَ يغفِلُ مَـا مضَى   وَلا أنَ مَـا يخفَى عَلَيْـهِ يغيب

واتە: ئەگەر رۆژێك تەنیا کەوتی نەلێی: تەنیام، بەلکو بلێ چاودێرێك بەسەرمەوەیە، وا گومان مەبە خوا بێ ئاگایە لەوەی رابردووەو رووی داوە، هیچ شتێکی شاراوە لای ئەو پەنهان نیە.

پێویستە بانگخواز بەو مانا ئیمانییانە خۆی پێ بگەیەنێ، وە بەو مانا ئیمانییانە رووبەڕووی ململانێکانی ژیان ببێتەوە.

## نیاز پاکیی (الإخلاص)

لە ڕاستیدا نیازپاکیی هێزێکی ئیمانییە، وە ململانێیەکی نەفسیە، "پاش بەردانو ڕاکێشان" خاوەنەکەی پاڵ پێوە دەنێ کە خۆی داماڵێنێ لە هەموو بەرژەوەندییەکی تاکە کەسیی، وە خۆی دەربێنێ لە نێو مەبەستە تاکە کەسیەکان، مەبەستی لە کارو کردەوە ئەنجامدان تەنها زاتی خوا بێ، بێ ئەوەی لە پاڵ ئەنجامدانی ئەم کردەوانە چاوەڕوانی سوپاسو پاداشت دانەوەیەك بێ لە غەیری خوا.

وە ئەگەر کەسی نیازپاك بەردەوام بێ لەسەر ئەم حاڵە لە تێکۆشانو سەربکەوێ بەسەر وەسوەسەکانی شەیتانو نەفسی فەرمانکەر بە خراپە، ئەوکاتە نیازپاکی لە هەموو کردەوەکانی دەبێتە ڕەوشتێكو عادەتێك، بەڵکو وای لێدێ بێ هیچ ماندووبوونو فشارێك هەرچی کردەوەیەك کە ئەنجامی دەدات بەتەنها بۆ خوای ئەنجام دەدا بەو پەڕی نیازپاکییەوە، (واتە: عادەتو دەقی پێوە دەگرێ).

وە هەر ئەو مانایە بۆ نیازپاکی مەبەستە لەم ئایەتە موبارەکانەی خوارەوە:

- ﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُواْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلْقَيِّمَةِ ﴿٥﴾ ﴾البینة.

واتە: (لەگەڵ ئەوەشدا) کە فەرمانیان پێ نەدرابوو مەگەر بەوەی کە پەرستشی خوا بکەن، بە دڵسۆزیو ملکەچیی، خۆیان بە دوور بگرن لە هەموو بیرو باوەڕێکی خوارو خێچ، وە نوێژ بکەنو زەکات بدەن، وە ئەمەیە ئایینی ڕاست.

- ﴿ فَمَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴿١١٠﴾ ﴾ الکهف.

واتە: جا هەر کەس بە تەمایە بە خزمەت پەروەردگاری بگات (لە قیامەتدا) ئەوە با کردەوەی چاك بکات، وە لە پەرستنی پەروەردگاریدا کەس نەکات بە هاوبەشی.

- ﴿ وَيُطْعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ٨ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَآءً وَلَا شُكُورًا ٩ ﴾الإنسان.

واتە: وە خواردن بە هەتیوانو هەژارانو دیلان (بەند کراوان) دەدەن بـا حەزیشیان لێ بێ، (دەڵێن) ئێمە بەڕاستی خواردنتان دەدەینێ هەر لەبەر خوا، چاوەڕوانی ناکەین لە ئێوە نە پاداشتو نە سوپاس.

* وە هەر ئەو نیازپاکییە مەبەستە لەو فەرمایشتەدا کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: {**إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى دُنْيَا يُصِيبُهَا أَوْ إِلَى امْرَأَةٍ يَنْكِحُهَا فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ**} رواه أحمد برقم (١٦٨)، والبخاري برقم (١)، ومسلم برقم (١٩٠٧).

هەروەها پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: {**إِنَّ اللَّهَ لا يَقْبَلُ مِنْ الْعَمَلِ إِلاَّ مَا كَانَ لَهُ خَالِصًا وَابْتُغِيَ بِهِ وَجْهُهُ**} أخرجه النسائي برقم (٣١٤٠) والطبراني برقم (٧٦٢٨) قال الحافظ في الفتح (٦/٢٨): إسناده جيد.

واتە: خوا کارو کردەوەیەك وەرناگرێ، مەگەر بۆ ئەو بە نیازپاکیی ئەنجام درابێ، وە لە پێناوی ئەو (خوا) ئەنجام درابێ.

وە کاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم موعاذ رضي الله عنه دەنێرێ بۆ یەمەن، موعاذ دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئامۆژگاریم بکە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی دەفەرموێ: {**أَخْلِصْ دِينَكَ يَكْفِيكَ الْقَلِيلُ مِنَ الْعَمَلِ**} أخرجه والحاكم برقم (٧٨٤٤).

واتە: لە دینداریدا نیازپاکبە، ئەنجامدانی کردەوەیەکی کەم بەستە، (واتە: ئەگەر کردەوەکانت بەتەنها بۆ خوا ئەنجامدا ئەوە ئەگەر کەمیش بن بەستە).

**بەڵام حەقیقەتی کردەوەیەک بە نیازپاکییەوە چییە؟!**

هەر کردەوەیەك بەندە ئەنجامی دەدا لە ژیانیدا، لای خوا وەرناگیرێ، وە بۆی تۆمار ناکرێ لە تەرازوی چاکەکانی مەگەر ئەو دوو مەرجەی تێدابێ:

**یەکەم:** شەرع دانی پێدانابێو (موافق)ی شەریعەت بێ.

**دووەم:** بەتەنها بۆ خوا ئەنجام درابێ.

ئەگەر کردەوە موافقی شەریعەت بێ، بەڵام بە نیازپاکییەوە بۆ خوا ئەنجام نەدرابێ وەرناگیرێ، وە ئەگەر بە نیازپاکییەوە بۆ خوا ئەنجام درابێ بەڵام موافقی شەریعەت نەبێ، دیسان وەرناگیرێ، کەواتە: کردەوە وەرناگیرێ لای خوا مەگەر بۆ خوا ئەنجام درابێ بەو پەڕی نیاز پاکییەوە، وە موافقی شەریعەتیش بێ.

ئەو واتایە بۆ وەرگیرانی کردەوە لای خوای بەرزو مەزن زانایانی پێشی ڕوونیان کردۆتەوە، وە بە قوتابیەکانیان ڕاگەیاندوە، وە ئەوە دوای ئەوە جیلی مسوڵمانانیان لێ ئاگادار کردۆتەوە، بۆ ئەوەی هەر جیلێك پەروەردە بێ لەسەر شوێنکەوتەی تەواوی شەریعەتو ڕاستگۆیی‌و نیازپاکیی لە ئەنجامدانی کردەوەکانیدا.

*** براو خوشکی بانگخواز گوێ لەو گفتو گۆیە بگرە لەگەڵ یەکێ لە زانایانی پێشین:**

پرسیار لە (فضیل بن عیاض) کرا دەربارەی مانای چاکترین کردەوە لەم فەرمایشتەی خوای پەروەردگار کە دەفەرموێ: ﴿ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴾ الملك، گوتی: مەبەست لە (أَحْسَنُ عَمَلًا) چاکترین کردەوە بریتیە لەو کردەوەی بەو پەڕی نیازپاکیی‌و موافقی شەریعەتەوە ئەنجام دەدرێ.

وە فەرموی: ئیخلاص ئەوەیە بۆ خوا ئەنجام درابێ، وە (الصواب) ئەوەیە شەریعەت دانی پێدانابێ‌و بەگوێرەی شەریعەتی خوا بێ[١].

وە بانگخواز زۆر لە پێشترە لە کەسانی دیکە بزانێ کردەوەی باش‌و وەرگیراو لای خوا کامەیە.

براو خوشکی بانگخواز! ئەوەی لەسەرت پێویستە بەر لە هەموو شتێکی دیکە ئەوەیە سەیری ئەو کردەوانە بکەی کە ئەنجامیان دەدەی: ئایا بە گوێرەی شەریعەتی خوایە، دەچێتە ئەو چوار چێوەیەی کە خوای پەروەردگار بۆ بەندەکانی کێشاویەتی؟ وە ئایا بە نیازو مەبەستێکی پاك تەنها بۆ خوای بەرزو مەزن ئەنجامت داون؟ ئایا لە پاڵ ئەنجامدانی ئەو کردەوەیەت چاوەڕەوانی هیچ سوپاس‌و ستایشێك نەبووی لەلایەن کەسێکەوە؟ ئەگەر بەم شێوەیە ئەنجامیان دەدەی ئەوە داوا لە خوای پەروەردگار بکە ڕاگیراوت بکات، وە لە هەوڵدان بەردەوامبە بۆ زیاترو زیاتر، وە پلە پلە سەرکەوە بەرەو کامڵ بوون، بەڵام ئەگەر بە پێچەوانەت ئەنجام داوە ئەوە بگەڕێوە لای خوا، نیەت‌و مەبەستت ڕاست بکەوە، وە ئیخلاص‌و نیاز پاکیت بۆ خوا بسەلمێنە، وە بە هەموو توانایەکیشت هەوڵبدە ئەوانەی ئەنجامی دەدەی بە گوێرەی شەریعەتی خوا بێ، نەك کردەوانێك بن شەریعەتی خوا فەرمانی پێ نەکردبێ.

**بانگخوازانی نیازپاك بەچی دەناسرێنەوە؟**

کەمێك بەر لە ئێستا باسی ئەوەمان کرد کە هیچ کردەوەیەك وەرناگیرێ لای خوای باڵادەست مەگەر بە نیازێکی پاك بۆ خواو بەگوێرەی شەریعەت ئەنجام درابێ، بە

---

١) ئەم بەسەرهاتە لە کتێبی (مختصرة تکوین الشخصیة الإنسانیة) وەرگیراوە.

پشت بەستن بەمە بۆ وەرگیرانی کردەوەکان لای خوا پێویستە لەسەر بانگخوازان درك بەم ڕاستیانەی خوارەوە بکەن:

١)- مەبەستیان لە بانگخوازیەکەیان تەنها خوا بێ.

٢)- هەموو هەڵسانو دانیشتنو کردەوەو سلوکێکی کۆمەڵایەتیان بە گوێرەی شەریعەتی خوا بێ.

٣)- بەردەوام لێ پێچینەوە لە خۆیان بکەن، وە بە شێوەیەکی بەردەوام پرسیار لە خۆیان بکەن مەبەستیان چییە لە ڕاگەیاندنی ئەم بانگەوازە؟ وە مەبەستیان چییە لە بانگ کردنی خەڵك؟

٤)- سەیری کردەوەکانیان بکەن ئایا وەك ئەو قسانە وایە کە دەیکەن، یاخود وەك ئەو حاڵەیە کە تێیدان؟

٥)- وریابن لە فێڵو تەڵەکەی شەیتانو وەسوەسەی نەفسو هەواو ئارەزوو، وە وریاو ئاگاداربن لە فیتنەی بە خۆ سەرسام بوونو پێ هەڵخلیسکان بە هۆی ڕووپامایی (ریاء)وە.

بە بۆچوونی من بانگخوازان ئەگەر دەرك بەو حەقیقەتانە بکەن، وە خۆیان بەو وەسفانەی سەرەوە برازێننەوە، ئەوە ڕاستگۆن لە گرتنەبەری ڕێگای ئیخلاص، وە بە ئیخلاصەوە ڕێ دەکەن لە ڕێگای بانگەواز، وە خوای کاربەجێش ئەوکاتە چاکسازی لە ئینسانەکان دەهێنێتە دی لەسەر دەستی ئەوان، وە گەلو میللەتانیان پێ هیدایەت دەدات، بەڵکو خەڵکی پێیان کاریگەر دەبن، وە وەڵامی بانگەوازەکانیان دەدەنەوە، وە بە هەڵبژارنو ئازادی خۆیان ڕێنموویی خوای پەروەردگار وەردەگرن بەو پەڕی ملکەچییەوە.

براو خوشکی بانگخواز!

بۆ ئەوەی شوێنەواری نیازپاکیت بۆ دەربکەوێ لە بانگەوازی کردن بۆ لای خوا، وە بۆ ئەوەی شوێنەواری کەسانی نیازپاکت بۆ دەرکەوێ لە کاریگەرییان بەسەر خەڵکی، گوێبگرە لەم بەسەرهاتە بۆت دەردەکەوێ نیازپاکی چ کاریگەرییەکی هەیە، وە بە پێچەوانەوە هەواو ئارەزووش چ بە ئینسان دەکات؟

یەکێ لە عابیدەکانی ئۆممەتانی پێشتر زەمەنێکی زۆر خەریکی خواپەرستی بوو، کۆمەڵێ خەڵك هاتنە لای پێیان گوت: لە فلان شوێن قەومێك هەن دارێك دەپەرستن لە جیاتی خوا، بە بیستنی ئەمە زۆر تورە بوو، تەورەکەی هاوێشتە سەر ملی بۆ ئەوەی دارەکە ببڕێتەوە، ئیبلیس لەسەر شێوەی پیاوێکی پیر هاتە سەر ڕێگەکەی پێی گوت: بۆ کوێ دەچی ڕەحمەتی خوات لێبێ؟

گوتی: دەمەوێ ئەو دارە ببڕمەوە.

ئیبلیس گوتی: تۆ چ کارێکت بەم دارەیە، وازت لە خوا پەرستیەکەت هێناوەو خۆت سەرقاڵ کردووە بە غەیری پەرستنی خوا!

گوتی: ئەمەش بەشێکە لە خواپەرستییەکەم.

ئیبلیس گوتی: من ناهێڵم ئەو دارە ببڕیتەوە.

بوو بەشەڕیان زۆری نەخایاند کابرای عابید ئیبلیسی بە زەوی داداو لەسەر سنگی دانیشت.

ئیبلیس پێی گوت: وازم لێبێنەو بەرمدە با هەندێ قسە بکەین، ئەویش هەڵسایەوە.

ئیبلیس گوتی: ئەی کابرا خوا ئەمەی لەسەر تۆ پێویست نەکردووە خۆ تۆ ئەم دارە ناپەرستی، چ پەیوەندیت بە خەلکی دیکە هەیە دەیپەرستن یان نا، خوای پەروەردگار پێغەمبەرانی هەیە لە هەموو بەشەکانی ئەم زەویەدا، ئەگەر بیویستبا بۆی دەناردن‌و فەرمانی پێ دەکردن بیبڕنەوە!!.

کابرای عابید گوتی: هەردەبێ بیبڕمەوە.

دووبارە شەڕ لەن ێوانیان سەری هەلدایەوە، کەوتنە ڕاکێش ڕاکێشی یەکدی، بۆ جاری دووەم کابرای عابید توانی زالّ بێ، لەسەر سنگی دانیشت، کاتێ ئیبلیس بێ توانایی خۆی بینی ڕێگەی دیکەی گرتە بەر، زانی کە ئەو عابیدە هەتا بەم ئیخلاصەوە کارەکانی بکات هیچ هێزێك لەسەر زەوی ناتوانێ بەسەریدا زالّ بێ، بۆیە پەنای بۆ ئەوەبرد نیەت‌و مەبەستی کابرای عابید بگۆڕێ، شتێکی تووش بکاو نیازو مەبەستەکەی بگۆڕێ بۆ غەیری خواو پاداشتی خوا.

گوتی: بۆ نایەی لەسەر شتێك پێك بێین کە سوودی زۆری بۆت هەیە؟

کابرای عابید گوتی: ئەو شتە چییە؟

ئیبلیس گوتی: تۆ بەرمدە تا پێت بلێم، ئەویش بەریدا.

ئیبلیس گوتی: تۆ پیاوێکی کەم دەرامەتی هیچ شتێکی وات نییە، بووی بە بارگرانی بەسەر خەلکی‌و ئەوان دەتژیەنن، وە لەوانەیە تۆش حەز بکەی فەزلّ‌و چاکەت هەبێ بەسەر برادەرانت، وە حەز دەکەی یارمەتی دراوسێکانت بدەی، وە برسیەکان تێر بکەی‌و وە بێنیاز بی لە خەلکی؟

کابرای عابید گوتی: بەلێ!!

ئیبلیس گوتی: واز لەم کارە بێنە، لەسەر من بێ هەموو شەوێك دوو دینار لەژێر سەرت دادەنێم، بەیانیان کە هەلسای هەلیگرەوە بۆ خۆت‌و خێزانت سوودی لێ

ببینە، وە خێریشی پێ بکە، ئەمە سوودی زۆرترە بۆ مسوڵمانان لە بڕینی دارێك کە لە شوێنی خۆیدا شین بووە، بڕینی ئەو دارە هیچ زەرەرێك بە وانە ناگەیەنێ کە دەیپەرستن، وە هیچ سوودێکیشی بۆ برا ئیماندارەکانت نیە!!.

کابرای عابید هەندێك بیری کردەوە پاشان گوتی: ئەم پیاوە پیرە ڕاست دەکات، خۆ من پێغەمبەر نیم لە ئەستۆی من بێ بڕینەوەی ئەم دارە، وە خۆ خوا فەرمانی پێ نەکردووم تا بیبڕم، تا ئەوەی ئەگەر نەیبڕم گوناهبار بم، ئەوەی ئەم پیاوە پیرە پێی گوتم سودی زۆر زیاترە، بۆیە دەستی خستە نێو دەستی ئەو پیاوە پیرەو پەیمانیان بەست.

ئیبلیس پەیمانی پێدا کە وەفای بەو پەیمانە هەبێ، وە سوێندیشی بۆ خوارد.

کابرای عابید گەڕایەوە شوێنەکەی خۆی، شەوی کردەوە، بۆ بەیانی دوو دینارەکەی بینی لای سەری، بۆ بەیانی بەهەمان شێوە، بەڵام بۆ ڕۆژی سێیەم و دواتریش هیچ شتێکی نەبینی!!

تووڕەبوو تەورەکەی خستە سەر شانی، ڕۆیی بەرەو ئەو شوێنەی کە دارەکەی لێبوو، دووبارە ئیبلیس بەرەو ڕووی هات لەسەر شێوەی پیاوێکی پیر، پێی گوت: دەتەوێ بۆ کوێ بچی؟

گوتی: دەمەوێ ئەو دارە ببڕمەوە.

ئیبلیس گوتی: درۆت کرد! بەخوا تۆ توانای ئەنجامدانی ئەو کارەت نییە.

کابرای عابید بۆی چوو بۆ ئەوەی وەکو جاری یەکەم بەزەویدا بدات، بەڵام چی بەسەرهات؟ ئیبلیس گرتی و بە زەویدادا وەك چۆلەکە کەوتە ژێر پێیەکانی ئیبلیس، ئیبلیس لەسەر سنگی دانیشت، پێی گوت: واز لەم کارە دەهێنی یان سەرت ببڕم؟

کابرای عابید سەیری کرد هێزی نیە خۆی ڕزگار بکا، گوتی: سەرکەوتی بەسەرمدا، هەواڵم پێ بدە چۆن جاری یەکەم من توانیم سەرکەوم بەسەرتدا، کەچی تۆ ئەمجارە سەرکەوتیت بەسەرمدا؟

ئیبلیس پێی گوت: چونکە تۆ جاری یەکەم تووڕە بوونەکەت لەبەر خوا بوو، نیەتو مەبەستت ئاخیرەت بوو، بە هێزی خوا سەرکەوتیت بەسەرمدا، بەلاّم ئەوجارەیان توڕە بوونەکەت بۆ پارەو بۆ نەفسی خۆت بوو توانیم بەسەرتدا زاڵ بم)[٢].

هەر بە هۆی ئیخلاصەوە کاریگەریی بەدەست دێت، ڕێز بەدەست دێت، متمانە بە دەست دێت، با کەسی بانگخواز خۆی بە ئیخلاص بڕازێنێتەوە، وە دوور بکەوێتە لەو شوێنانەی پێی تێدا هەڵدەخلیسکێ و تووشی دەرچوون دەبێ.

وریابە لە فێڵی شەیتان، وە ڕیای نادیارو شاراوە، وە پەتەکانی ئارەزوو، وە وەسوەسەی نەفسی فەرمانکەر بە خراپە، ئەگەر دەتەوێ ئەم بانگەوازە بلاّو بێتەوە، وە عیززەتو شانازی بۆ ئیسلام بگەڕێتەوە، وە کیانێك بۆ ئەم ئوممەتە دروست بێ، ئەو کاتە ئیمانداران دڵخۆش دەبن بە سەرکەوتنی خوا.

---

٢) لە کتێبی (من صفات الداعیة)ی محمد الصباغ وەرگیراوە. ص ٤٥، ئەویش لە کتێبی (الإحیاء)ی خواستۆتەوە.

## جورئەت

لە ڕاستیدا جورئەت ئەو هێزە دەروونیە چاکەیە کە بانگخوازی ئیماندار بە هۆی ئیمانی پتەوی بە خوای تاكو بێ هاوتا، وە بە هۆی ئەو حەقەی کە دەست لەملانێی بووە، وە بە هۆی ئەو ژیانە نەبڕاوەی دوای مردن کە یەقینی بۆ دروست بووە دەربارەی، وە بە هۆی ئەو قەدەرەی کە تەسلیمی بووە، وە بە هۆی ئەو بەرپرسیارێتیەی کە هەستی پێ دەکات، وە بە هۆی ئەو پەروەردە ئیسلامییەی کە پێی گۆشت کراوە، بۆی فەراهەم دەبێو بەدەستی دێنێ.

وە ئیماندار بە قەد ئیمانی بەو خوایەی کە هەرگیز ژێر ناکەوێ، وە بە قەد ئیمانی بەو حەقەی کە هەرگیز سەرشۆڕ نابێ، وە بە قەد ئیمانی بەو قەدەرەی کە هەرگیز ناگۆڕێ، وە بە قەد ئیمانی بەو بەرپرسیارێتیەی کە لەسەریەتی، بە گوێرەی پتەوی ئیمانی بەمانە هەمووی جورئەتو ئازایەتیو چاونەترسی بۆ پەیدادەبێ، وە زیاتر دەتوانێ بانگەوازی بۆ وشەی حەق بکاو لە لۆمەی لۆمەکاران نەترسێ.

* لێرەوەیە فەزڵی بوونی جورئەت لەسەر حەق لە گەورەترینی جیهادەکانە: وەك پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: {أَفْضَلُ الْجِهَادِ كَلِمَةُ حَقٍّ عِنْدَ سُلْطَانٍ جَائِرٍ} أَخْرَجَهُ أَبو دَاوُد برقم: (٤٣٤٤)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٠١١). واتە: باشترین جیهاد گوتنی وشەی حەقە بەرانبەر دەسەڵاتدارێکی ستەمکارو لادەر.

* ئا لێرەوە گەورەی شەهیدان (حەمزەی کوڕی عبدالمطلب)ە، وە کەسێکیش لە پێناوی ووشەی حەقدا شەهید دەبێ لە ڕیزی حەمزەیە خوا لێی ڕازی بێ، ئەوەتا پێغەمبەری خوا صَلَّى الله عليه وسلم دەفەرموێ: {سَيِّدُ الشُّهَدَاءِ حَمْزَةُ بنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، وَرَجُلٌ قَامَ إِلَى إِمَامٍ جَائِرٍ، فَأَمَرَهُ وَنَهَاهُ، فَقَتَلَهُ}، أَخْرَجَهُ

الحَاكِم برقم: (٤٨٨٤) وقال: صحيح الإسناد، والطبراني برقم: (٤٠٧٩), وصحَّحهُ الألباني في (صَحِيح الْجَامِع) برقم: (٣٦٧٥), و "الصَّحِيحَة" برقم: (٣٧٤).

واتە: سەردارو گەورەی شەهیدا (حەمزەی کوڕی عبدالمطلب)ە، وە پیاوێکە لەبەدەم پێشەوایەکی ستەمکاردا هەڵدەستێتەوەو فەرمانو قەدەغەی خوای پێ ڕادەگەیەنێ ئەویش دەیکوژێ.

* بە هەمان شێوە دەبینین پێغەمبەری خوا صَلّی الله علیه وسلم پەیمانی لە هاوەڵان وەرگرت کە هەمیشە حەق بێژین لە هەر شوێنێکدابن، وەك هاتووە لە عوبادەی کوڕی صامت دەڵێ: {بَايَعْنَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ فِي الْعُسْرِ وَالْيُسْرِ وَالْمَنْشَطِ وَالْمَكْرَهِ وَعَلَى أَثَرَةٍ عَلَيْنَا وَعَلَى أَنْ لَا نُنَازِعَ الْأَمْرَ أَهْلَهُ وَعَلَى أَنْ نَقُولَ بِالْحَقِّ أَيْنَمَا كُنَّا لَا نَخَافُ فِي اللَّهِ لَوْمَةَ لَائِمٍ} رواه مسلم برقم: (١٠٧٩).

واتە: بەیعەتماندا بە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەسەر گوێگرتنو گوێڕایەڵی، لە کاتی خۆشیو ناخۆشیدا، وە لەکاتی چوستو چالاکیو بێ هێزیدا، وە هەردەم ئەو بەسەر خۆماندا هەڵبژێرین، وە کێشەو مشتو مڕ لەگەڵ ئەو کەسەدا نەکەین کە لەسەرمانی دەکاتە فەرمانڕەوا، وە حەق بێژین لە هەموو شوێنێکدا، وە لە گوتنی حەقیشدا لە لۆمەی لۆمەکاران نەترسین.

* هەر دەربارەی جورئەتو چاونەترسی کەسی بانگخواز، ئەوەتا خوای تەعالا ستایشی ئەو کەسانە دەکات کە پەیامەکەی خوا دەگەیەنن‌و وە هەر لەو دەترسن‌و لە غەیری ئەو ناترسن، وەك دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَٰلَٰتِ ٱللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُۥ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا ٱللَّهَ ۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا ٣٩ ﴾الأحزاب.

واتە: کەسانێ کە پەیامەکەی خوا ڕادەگەیەنن وە لە (خوا) دەترسن‌و بێجگە لە خوا لەهیچ کەسی دیکە ناترسن خوا بەسسە بە چاودێر.

وە مێژووی بانگەوازو بانگخوازان پڕن لەو کەسانەی کە حەق بێژ بوون‌و لە لۆمەی لۆمەکاران نەترساون.

چەند نمونەیەکی زیندووی ئەو پیاوانەی کە حەق بێژ بوون‌و لە بەر خوا لە لۆمەی لۆمەکاران نەترساون.

بەڵکو بانگخوازانمان بەو نموونانە کاریگەر بن‌و، دەست بە چاکترینی هەڵوێستەکانیان بگرین:

أ- لە هەڵوێستەکانی (عیززی کوڕی عەبدوسسەلام): جارێکیان لە دانیشتنێکدا کە پڕ بوون لە پیاوانی دەوڵەت بە سوڵتانی میصر (نجم الدین أیوب)ی گوت: ئەی ئەیوب! چ وەڵامی خوا دەدەیەوێ لە ڕۆژی دوایی ئەگەر پرسیارت لێ بکات: ئایا مولکی میسرم بە تۆ نەدا کەچی تۆ مەشروبت تێدا حەڵاڵ کردو ڕێگەت دا کڕین‌و فرۆشتنی پێ بکرێ؟

سوڵتان گوتی: ئایا ئەمەی تۆ دەیڵێی ڕووی داوە؟

گوتی: بەڵێ، فلانە شوێن کڕین‌و فرۆشتنی مەشروبی لێ دەکرێ، وە خراپەکاری لێ دەکرێ، تۆش لە خۆشی نیعمەتەکاندی ئەو مەملەکەتە پاڵ کەوتوی!!.

سوڵتان گوتی: ئەمە من نەمکردووە، ئەوەی تۆ دەیڵێی ئەو کاتەیە کە باوکم لەسەر حوکم بوو!

عیزز گوتی: واتە تۆ لەو کەسانەی کە دەڵێن: ﴿...إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ٢٣﴾الزخرف، واتە: بەڕاستی ئێمە باوو باپیرانی خۆمان

لەسەر ئایینێك بینیوە وە بەڕاستی ئێمە لەسەر ئاینی ئەوان دەڕۆین، ئەمەش وای لە سوڵتان کرد ئەو شوێنە قەدەغە بکاو دایبخات[٣].

ب- (ئەبو موسلیمی خەولانی) کاتێ دەچووە لای موعاویە، پێی دەگوت: سڵاوی خوات لێبێ ئەی بەکرێ گیراو، ئەوانەی دەوری هەوڵیان دەدا بە ئەبی موسلیم بڵێن: بڵێ: سڵاوی خوات لێبێ ئەی ئەمیر، بەڵام ئەبو موسلیم ئەم داوایەی ڕەت دەکردەوە، پاشان ڕووی لە موعاویە دەکردو دەیگوت: (تۆ بەکرێ گیراوی بۆ ئەم ئۆممەتە، پەروەردگارت بە کرێی گرتووی بۆ چاودێری ئەوان)[٤].

ج- کاتێ (عبدالرحمن ناصر) بەو پەڕی داهێنانەوە شاری زەهرائی لە وڵاتی ئەندەلوس بونیاد نا، ئەوەندە پارەی لێدا کە لەژمارە نەدەهات، ئەو پارە زۆرەو جوانکارییە لە درووست کردنی ئەو شارە لە هەموو شوێنێك دەنگی دایەوە، وە هەواڵەکە گەیشتە (منذر بن سعید) بە بیستنی هەواڵی بە فیڕۆدانی ماڵو موڵکی گەل زۆر تووڕە بوو، بە ئامادەبوونی ناصر لەبەر دەم خەڵکدا چووە سەر مینبەری مزگەوت، ڕووب لۆمەو سەرکۆنەی کردە ناصر، پێی گوت: (پێم وانییە شەیتان خوا خەجاڵەتی بکات گەیشتبێتە ئاستی تۆ، وە ئەو ئیمکانیەتەی پێ نەدراوە کە بە تۆ دراوە، کەچی خوا هاوێشتیە ڕیزی کافران!!).
(عبدالرحمن ناصر) گرژ بوو لە کاتی بیستنی قسەکانی (منذر بن سعید)، یەکسەر قسەکانی پێ بڕی‌و گوتی: سەیر بکە تۆ دەزانی چی دەڵێی؟ چۆن خوای گەورە

---

٣) لە کتێبی (تربية الأولاد في الإسلام) ی دانەر وەرگیراوە ص ٣٧٨.
٤) لە کتێبی (تربية الأولاد في الإسلام)ی دانەر وەرگیراوە ص ٣٧٨.

دەعاتـە پێگـەی کـافران؟ (منـذر بـن سـعید) گـوتی: بـا، ئـەدی ئـەوە نیـە خـوا دەفـــەرموێ: ﴿ وَلَوْلَآ أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً لَّجَعَلْنَا لِمَن يَكْفُرُ بِٱلرَّحْمَٰنِ لِبُيُوتِهِمْ سُقُفًا مِّن فِضَّةٍ وَمَعَارِجَ عَلَيْهَا يَظْهَرُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾الزخـرف، واتــە: خـۆ ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایـە کـە خـەڵکی بـبن بـە ئوممـەتی بێبـاوەڕ وامـان دەکـرد هەرکەس بێ باوەڕ بوایە بەخوای میهرەبان سەقفی خانووەکانیـان لـە زیـو بووایـە، هەروەها پلەکان کە پێیدا سەردەکەون (بۆمـان دەکـردن بـە زیـوو)، خەلیفـە ڕووی خۆی وەرگێڕاو فرمێسکەکانی بە ڕیشیدا هاتنـە خـوارەوە لـە ترسـی خـوای پـاك‌و بێگەرد، پاشان ڕووی کردە قازی (منـذر بـن سـعید)و پێـی گـوت: (خـوای گـەورە پاداشتت بداتەوە لە جیاتی مسوڵمانان‌و دینەکەی، خوا نموونەت زۆر بکات، سوێند بە خوا ئەوەی تۆ گوتت حەق بوو) لە دانیشتنەکە هەڵسـاو داوای لێخۆشـبوونی لـە خوا کرد، فەرمانی کرد قوببەکە هەڵبوەشێننەوەو لە خۆڵ دروستی بکەن[٥].

د- ئەبو حامیدی غەزالی لە (إحیـاء)ەکەی خۆی ئەم بەسـەرهاتە دەگێڕێتـەوە: لـە ئەصمەعیەوە دەڵێ: (عطاء بن أبي رباح) دەچێتە لای (عبدالملك بـن مـروان) ئـەو کاتەی کە خەلیفە بوو، لەو وەرزی حەجدا، (عبـدالملك) لەسـەر ڕایەخەکـەی خـۆی لەگەڵ دەست‌و پێوەندەکانی دانیشتبوو، کاتێ چـاوی بـە (عطـاء) کـەوت لەبـەری هەڵسایەوە، لەگەڵی دانیشت، پێی گوت: ئەی باوکی موحەممەد! چ پێداویسـتیەکت هەیە؟

(عطاء) گوتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران لە خوا بترسە لـەماڵی خـواو لـە حـەرەمی پێغەمبەری خوا، لە خوا بترسە دەربارەی نەوەکانی موهـاجیرین‌و ئەنصـار، تـۆ بـە

---

٥) لە کتێبی (إلی ورثة الأنبیاء)ی دانەر ص ٤٥،٤٤.

هۆی ئەوانەوە لێرە دانیشتووی، تۆ بەرپرسیاری لە کاروباری مسـولّمانان، لـە خـوا بترسە دەربارەی ئەو کەسانەی لـەدەرگای تـۆدا وەسـتاون، بـێ ئاگـا مەبـە لێیـان، دەرگای خۆتیان لەسەر دانەخەی!!

(عبـدالملك) گـوتی: باشـە وا دەکـەم، پاشـان (عطـاء) هەڵسـا بـۆ ئـەوەی بـڕوا، (عبدالملك) دەستی گرتو پێی گوت: تۆ ئەوەی داوات کرد بـۆ غـەیری خـۆت بـوو هەمووی جێبەجێ دەکەین، بۆ خۆت چیت پێویستە بۆت بکەین؟

(عطاء) گوتی: مـن هـیچ پێویسـتیەکم بـە درووسـتکراوەکانی خـوا نیـە، پاشـان ڕۆیشت.

ئەوەی لەسەر بانگخوازانـە بریتیـە لـەوەی چـاو لـە پێشـینە چـاکەکان بکـەن لـە جورئەتو ئازایەتییان، بەڵکو خەڵکی بـەرەو بەدەسـتهێنانی بەرژەوەندییـە دیـنیو دنیاییەکانیان بچنو خراپەکاریەکان لە خۆیان دوور خەنـەوە، وە دەبـێ بـانگخوازان کارلێك لەگەڵ کۆمەڵگاکانی خۆیان بکەن بۆ ڕاگەیاندنی وشەی حەق، بێ ئەوەی لـە لۆمەی لۆمەکاران بترسـن، بـەڵکو بـانگخوازان بـەم سیفەتەیان ببنـە داینـەمۆی گۆڕانکاری بەدەوری سـەرەکی خۆیـان هەڵسـن لـە چاکسـازیو پاکسـازی کردنـی کۆمەڵگا، خوای کاربەجێ لە دنیادا خێرو چـاکەیان دێنێتـە ڕێ، وە لـە قیامـەتـدا پاداشتی زۆریان بۆ هەڵدەگرێ، وە بـۆ ئـەوەی لەسـەر دەسـتی ئـەوان عیـزەت بـۆ ئیسلامو شکۆ بۆ مسولّمانان بگەڕێننەوە، وە وەحدەت بۆ مسـولّمانان بگەڕێتـەوە، وە مەشخەڵی حاکمیەت بێتەوە دەست شەریعەتی خوای تاكو پاك، ئەمەش بۆ خوا کارێکی قورس نیەو هیچ شتێك خوا دەستەوستان ناکات.

**پێویستە لەسەر بانگخواز جیاوازیی بکات لەنێوان جورئەتو ڕق هەڵسان**

جورئەت شتێکەو ڕق هەڵسان شتێکی دیکەیە:

* جورئەت ئەوەیە: حەق بێژ بی، بۆ گوتنی حەقیش حیساب بۆ هیچ کەسێك نەکەی ئەگەر لەسەریشی تووشی میحنەتو ئێشو ئازاربی، ئەمەش نابێتە رێگر لەبەردەم کەسی بانگخواز لەگەڵ جورئەتەکەشیدا نەرمو نیانو دانا بێ لەگەڵ ئەو کەسانەی کە ئامۆژگارییان دەکات.

بەڵکو بنچینەو بناغە لە بانگکردنی کەسی بانگ کراوو ئامۆژگاری کردنی کەسی ئامۆژگاری کراو نەرمو نیانیو بەزەییو حیکمەتو ئامۆژگاری جوانە، وەك خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ... ١٢٥﴾النحل.

واتە: (خەڵکی) بانگ بکە بۆ رێبازی پەروەردگارت بە لێزانییو داناییو ئامۆژگاری چاكو شیرین وە لەگەڵیان بدوێ (موجادەلە بکە) بە چاکترین شێوە.

* بەڵام رق ئەستوور بوون ئەوەیە لەگەڵ ئەو کەسەی کە بانگی دەکەی بۆ ئیصلاح بە ووشکیو دڵ رەقیو توندییەوە لەگەڵی دەست پێ بکەی، ئەم دەستپێکە خراپەش لای کەسی بانگکراو، یاخود ئامۆژگاری کراو پەرچە کردارێك دروست دەکات خۆیو بانگخوازەکە بەرەو چارەنووسێکی خراپ دەبات، بە تایبەت ئەگەر هاتوو ئەو کەسەی ئامۆژگاری دەکرێ خاوەنی پلەو پایەو هێزێك بێ.

*** هەر بەم بۆنەیەوە پێم خۆشە ئەم بەسەرهاتەتان بۆ باس بکەم:**

واعیزێك (بانگخوازێك) دەچێتە لای ئەبو جەعفەری مەنصور زۆر بەرق ئەستوریەوە لەگەڵی دەدوێ، ئەبو جەعفەر بە کابرای واعیز دەڵێ: ئەی کابرا تۆزێك لەسەرخۆبە لەگەڵم، خوای پەروەردگار زۆر لە تۆ باشتری نارد بۆ لای کەسێکی زۆر لە من خراپتر، مووسای نارد بۆ لای فیرعەون کەچی پێی فەرموو: ﴿ فَقُولَا لَهُۥ قَوۡلٗا

لَيِّنًا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ ﴿٤٤﴾ طه، واتە: جا قسەی لەگەڵ بکەن بە نەرمو نیانی بەڵکو بیر بکاتەوە، یا بترسێ (لە سزای خوا)، پیاوە واعیزەکە یەکسەر تووشی خەجاڵەتی بوو، بیری کەوتەوە کە نە ئەو باشترە لە مووسا سەلامی خوای لێ بێ، نە ئەبو جەعفەریش خراپترە لە فیرعەون.

بەڵێ لە هەندێ کاتدا توندیی و وشکی پێویستە بۆ کەسی بانگخواز وەك هەندێ لەو بەسەرهاتانەی کە پێشتر هێنامان بانگخوازان چۆن سوڵتانەکانیان ئامۆژگاری کردووە، بەڵام ئەم توندییە هەندێ جار هۆکارو پاساوی خۆی هەیە، هەروەك بینیمان لە هەڵوێستەکەی قازی (منذر بن سعد)، ئەو قازییە خراپیی بەکارهێنانی ماڵو موڵکی ئوممەتی روون کردەوە، کە لە شوێنی شایستەی خۆی خەرج ناکرێو بە فیڕۆ دەدرێ، هاوشێوەی ئەم خراپەکاریانە پێویست بەوە دەکات بانگخواز لە بەرانبەریدا حەزمی هەبێ، وە بابەتەکە بە ڕاشکاوی ڕوون بکرێتەوە، بەڵکو کابرای ستەمکار دەست لە زوڵمەکەی هەڵگرێ، وە ئەوەی کە ماڵو موڵکی گشتی بە فیڕۆ دەدا دەست هەڵگرێ لە خواردنو بە فیڕۆدانی موڵکی ئوممەت، هەر ئەمە بوو وای لە (عبدالرحمن الناصر) کرد ئەو خشتە زێڕو زیوانەی بەکاری هێنابوو، بیگەڕێنێتەوە بۆ (بیت المال) ڕوونو ڕاشکاویی ئەم قازییە بەڕێزە وای لێکرد کارێکی لەم جۆرە ئەنجام بدات.

ئەوەی کە پێویستە بگوترێ پاش ئەمە:

جورئەتو چاونەترسی لەسەر حەق ڕەوشتێکی ستایش کراوە لە کەسی بانگخواز، بنچینەو بناغە ئەوەیە بانگخواز لەسەر خۆیی‌و نەرم‌و نیانی تێدابێ، بە تایبەت لەگەڵ ئەوانەی کە سەرەتان، تەنها مەگەر لە حاڵەتێك نەبێ کە زۆر پێویست بەوە بکات ڕاشکاوانە ڕەفتار بکەی، لەو حاڵەتەدا کێشە نییە ئەگەر ڕاشکاوو خاوەن حەزم بی، بەمەرجێك سنوور شکێنی تێدا نەکرێ، وە سنووری حیکمەت‌و دانایی تێدا نەبەزێنرێ، وە نەبێتە هۆی سەرهەڵدانی ئاژاوەو فیتنە.

## ئارام گرتن

ئارام گرتن: بریتییە لە هێزێکی دەروونی باشی کاریگەر... وا لەو کەسە دەکات کە خۆی بەم سیفەتە ڕازاندۆتەوە بەرەنگاریی هەموو هۆکارەکانی بێهێزیی‌و تەمبەڵی‌و تەسلیم بوون ببێتەوە، وە خۆ ڕاگرتنی لەسەر شتە فریودەرەکانی دنیاو فیتنەکانیدا، وە بە هۆی ئەو ئارام گرتنەوە خۆی ڕادەگرێ‌و پێی هەڵناخلیسکێ بەرانبەر میحنەت‌و ناخۆشی‌و پێشهاتەکان.. تا ئەو کاتەی خوای پەروەردگار سەرکەوتنی بۆ دەنێرێ، یان ئەوەتا بەم شێوەیە دەگاتەوە بە خوای گەورەو خوای گەورەش لەو کاتەدا لێی ڕازییە..

**لەسەر بانگخواز پێویستە ئەو کاتەی پەیامەکانی دەگەیەنێ ئەم تاقیکردنەوانە لەبەر چاوی بگرێ:**

* ئەو حیسابە بۆ خۆی بکات کە هەندێ کەس تۆمەتی دەخەنە پاڵ‌و بە درۆی دەخەنەوەو، وە بە چەند قسەیەکی پڕو پوچ دەیانەوێ لە کەسایەتیەکەی کەم بکەنەوە.

* ئەو حیسابە بۆ خۆی بکات کە ڕۆژێك بەند دەکرێ‌و ئەشکەنجەو ئازاریش دەدرێ، وە هەموو کارێکی دوژمن کارانەی ماددی‌و بەدەنی لەبەر چاوی خۆی دابنێ کە ڕۆژێك دادێ ئەوانەی بەرانبەر دەکرێ.

* ئەوەش لەبەر چاوی خۆی دابنێ کە لە وەزیفەکەی دەردەکرێ، وە لەوانەیە ماڵ‌و موڵکی دەستی بەسەردا بگیرێ، وە سەرچاوەی ڕزق‌و ڕۆزیی کە کارەکەیەتی لێی قەدەغە بکرێ.

* وە ئەو حیسابە بۆ خۆی بکات، ڕۆژێك شاربەدەر دەکرێ، وە لە خێزان‌و دۆست‌و برادەرانی جیا دەکرێتەوە.

* ئەوە لەبەر چاوی خۆی دابنێ دەیانەوێ فریوی بدەن بە ماڵو وەزیفەو پۆستو پلەو پایە، وە لەوانەیە بیانەوێ فریوی بدەن بە هۆی ئافرەتو جنسەوە، وە ئەو فریودانەش زۆرجار پۆشاکی زەواجی دەخرێتە بەر.
* لەکۆتاییدا ئەو حیسابە بۆ خۆی بکات کە شەهید دەکرێ لە پێناوی خوای پەروەردگاردا، وە لە پێناوی بانگەوازی کردن بۆ دینی خوا.
ئەگەر بانگخواز ئەمانەی هەموو لەبەر چاوی خۆی دانا، ئەو کاتە تووش بوونی بە هەر یەکێك لەو تاقیکردنەوانەی سەرەوە نابێتە هۆی وازهێنانو سارد بوونەوەو ڕەش بینیو داڕوخان، چونکە هەر بۆخۆی سروشتی بانگخوازانی ڕاستگۆو زانایانی موخلیص وایە تووشی جۆرەها ئەزیەتو ئازار دەبن، ئەوەندەیان بەسە سەرۆكو سەرقافڵەی بانگخوازان (موحەممەد صلی الله علیه وسلم)یان لەبەرچاو بێ چی بەسەرهاتووە لە پێناو گەیاندنی پەیامەکەی خوا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە هەموو سەردەمێكو لە هەموو شوێنێکدا چاوساغێکی عەمەلییە بۆ بانگخوازان، لە ئارامگرتنو خۆڕاگرییو تەحەممول کردنی ئێشو ئازار.
هاوبەشدانەرانی مەککە هەموو ڕێگەیەکی ئەزیەتو ئازاریان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم تاقی کردەوە، بۆ ئەوەی ببنە بەربەست لەبەردەم بانگەوازەکەی، بەڵام ئەو تەسلیم تەبوو ملی بۆ نەدان.
ڕێگای فریودان بە ماڵو سەروەتو سامانو پلەو پایەیان لەگەڵی تاقی کردەوە، بەڵام تەسلیم نەبوو ملی بۆ نەدان.
ڕێگای فشار خستنەسەر لە ڕێگەی ژیانی خێزانییو کاریگەری عەشیرەتگەراییان لەگەڵیدا تاقی کردەوە، بەڵام دیسان ملکەچ نەبوو بۆیان.

وە ویستیان لە ڕێگەی قەدەغە کردنی هەموو سەرچاوەیەکی دابین کردنی بژێوی بۆ خۆی‌و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون فشاری بخەنە سەر بەڵام هەم دیسان ملکەچ نەبوو بۆیان.

لە کۆتاییدا بڕیاریاندا تیرۆری بکەن، دیسان ملی بۆ نەدان‌و سارد نەبوویەوە لە گەیاندنی پەیامی خوا.

پاش ئەوەش کە خوای پەروەردگار مۆڵەتی دا کۆچ بکات کەوتنە ململانێ کردنی بە جۆرەها شێوەو شێواز، بۆ ئەوەی شوێن کەوتوانی سارد بکەنەوە دیسان ئەمەش نەبووە هۆی ئەوەی لە کاری بانگخوازی بگەڕێتەوە دواوە، هەر بە ئارامی‌و وورەی بەرزو جیهادو تێکۆشانەوە مایەوە، بەردەوام بوو لەسەر ڕێگای گەیاندی پەیامەکەی تا ئەو کاتەی خوای بەرزو مەزن سەرکەوتنی خۆی بۆ نارد، خەلکی پۆل پۆل دوای فەتحی مەککە هاتنە ناو ئیسلام.

ئەمەش بەچی هاتە دی؟ بەو صەبرو خۆڕاگرییە پۆلایینەی پێغەمبەری خۆشەویست صلى الله عليه وسلم، وە بە فەزڵی ئەو قوربانی دان‌و جیهاو تێکۆشانە نەبڕاوەیە، با بانگخوازان گەر دەیانەوێ ڕێزو بەرزیی ئەم ئوممەتە بگێڕنەوە، عیززەتی ئیسلام بگێڕنەوە، ببنە هێزو پشت‌و پەناو وەحدەت بۆ مسوڵمانان چاو لە پێشەوای بانگخوازان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بکەن، ئەوەتا خوای کاربەجێ پێمان دەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَنْ كَانَ يَرْجُوا اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا ٢١ ﴾الأحزاب.

واتە: سوێند بە خوا بە ڕاستی لە پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم)، بۆ ئێوە هەیە سەرمەشقی‌و پێشەوایەتی چاك، بۆ کەسێك بە هیوای خواو (پاداشتی) ڕۆژی دوایی بێ، وە زۆر یادی خوا دەکات.

**پێویسته بانگخوازان له سوننەتی خوای پەروەردگار بگەن دەربارەی پێغەمبەران و پیاوچاكان و زاناو بانگخوازان!!**

پێویسته له سوننەتی خوای پەروەردگار بگەن دەربارەی پێغەمبەرانو پیاوچاكانو بانگخوازان كه له كاری بانگخوازییاندا تووشی چیان هاتۆته پێش؟ جۆرەها ئێشو ئازارو تاقی كردنەوە، لەبەر ئەوەی ئەوان پێشەنگی گۆڕانكاریی ئەو واقیعە تاڵە بووینە كه كۆمەڵگاكەیان تێیدا ژیاوە، ئەوان ڕووبەڕووی ستەمكارە ملهوڕەكانی سەردەمی خۆیان بوونەتەوە، وە ڕووبەڕووی میللەتانێك بوونەتەوە پەنهانو ئاشكرایان پیسو نەگریس بووە، بە هیچ شێوەیەك سۆزو هەستو نەستیان بۆ ئیمانداران نەجوڵاوەو سكیان نەسوتاوە، ئەمەش شتێكی سرووشتیە له كاتێكدا تۆ له نێو كۆمەڵگایەكدا بژی كه زۆربەی تووشی نەزانیو گومڕاییو شوێن كەوتنی ئارەزووەكانیان بووبن، ئەم تاقیكرنەوەو میحنەتو ئێشو ئازارەش خوای پەروەردگار له چەند شوێنێكدا بە ڕوونی ئاماژەی پێكردوە:

- دەفەرموێ: ﴿ الٓمٓ ١ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتۡرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمۡ لَا يُفۡتَنُونَ ٢ وَلَقَدۡ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ فَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡكَٰذِبِينَ ٣ ﴾ العنكبوت. واته: (ئەلیف لام میم)، ئایا خەڵك وا دەزانن كه وازیان لێ دەهێنرێ ئەگەر بڵێن بڕوامان هێناوە، ئیتر ئەوان تاقی ناكرێنەوە، سوێند بە خوا بێگومان كەسانی پێش ئەوانمان تاقی كردەوە (ئەمانیش تاقی دەكەینەوە) ئنجا بێگومان خوا ئەو كەسانەی ڕاستیان كرد دیاری دەكات، درۆزنەكانیش دیاری دەكات، (دەناسرێن).

- هەروەها خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُوا۟ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ ۗ أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ ﴿٢١٤﴾ ﴾البقرة.

واتە: ئایا واتان زانیوە کە دەچنە بەهەشت کەچی هێشتا نەهاتوتە ڕێتان ئەوەی تووشی ئەوانە بوون کە لە پێش ئێوەدا تێپەڕین، کە (لە ڕێی خوادا) دووچاری سەختی‌و زەرەرو زیان بوون، وە زۆر بەتوندی تەکان دران، بە جۆرێك کە پێغەمبەری ئەوانەی بڕوایان هێنابوو لەگەڵیدا، دەیانگوت: سەرکەوتنی خوا کەی دێت؟ ئاگادار بن‌و دڵنیابن بەڕاستی سەرکەوتنی خوا نزیکە.

- هەروەها لەسەر زمانی لوقمانی حەکیم کاتێك کوڕەکەی ئامۆژگاری دەکات دەفەرموێ: ﴿ يَٰبُنَىَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ ۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٧﴾ ﴾لقمان.

واتە: ئەی کوڕە شیرینەکەم! نوێژ بەجێ بێنە، فەرمان بە چاکەو ڕێگری بکە لە خراپە، هۆگرو بە ئارام بە لەسەر هەر بەڵاو ناخۆشییەك کە تووشت دێ، بێگومان ئەوە لەو کارە گەورانەیە کە خوا پێویستی کردوە.

هەروەها پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە چەندەها شوێن ئاماژەی بەوە کردوە:

- {عَنْ سَعد بن أَبِي وقّاص قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ! أَيُّ النَّاسِ أَشَدُّ بَلاءً؟ قَالَ: الأَنْبِيَاءُ ثُمَّ الْأَمْثَلُ فَالْأَمْثَلُ فَيُبْتَلَى الرَّجُلُ عَلَى حَسَبِ دِينِهِ فَإِنْ كَانَ دِينُهُ صُلْبَاً اشْتَدَّ بَلاؤُهُ، وَإِنْ كَانَ فِي دِينِهِ رِقَّةٌ ابْتُلِيَ عَلَى حَسَبِ

دِينِهِ، فَمَا يَبْرَحُ الْبَلَاءُ بِالْعَبْدِ حَتَّى يَتْرُكَهُ يَمْشِي عَلَى الأَرْضِ مَا عَلَيْهِ خَطِيئَةٌ} أَخْرَجَهُ ابْنُ حِبَّان برقم (٢٩٢٠)، وَالحَاكِم برقم (١٢٠) وَقَالَ: صحيح على شرط الشيخين.

واتە: لە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصەوە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا! کام (چین) لە خەڵکی تووشی زۆرترین تاقیکردنەوەو بەلا دەبن؟ فەرمووی: پێغەمبەران، پاشان شوێنکەوتەی ئەوانو شوێنکەوتەی دوای ئەوانیش، پیاو بەگوێرەی دینەکەی تاقی دەکرێتەوە، ئەگەر دینەکەی بەرێکیو بەو پەڕی تۆکمەیی گرتبوو، بەلاو تاقیکردنەوەی قورستر دەبێ، ئەگەر هاتو دینەکەشی بە تۆکمەیی نەگرتنبوو جێگیر نەبوو، بە گوێرەی ئەوەندە دینەی کە هەیەتی تاقی دەکرێتەوە، بەلاو تاقیکردنەوە واز لە بەندە ناهێنێ تا وای لێدەکات بەسەر زەویدا دەڕواو هیچ تاوانێکی پێوە نامێنێ.

- هەروەها دەفەرموێ: {حُفَّتْ الْجَنَّةُ بِالْمَكَارِهِ وَحُفَّتْ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ} أَخْرَجَهُ مسلم برقم: (٢٨٢٢)، وَابْنُ حِبَّان برقم (٧١٦). واتە: بەهەشت دەورە دراوە بە ناخۆشییەکان، وە ئاگر (دۆزەخ)یش دەورە دراوە بە ئارەزووەکان.

- وە پێشەوا بوخاری لە صەحیحەکەی خۆیدا هێناویەتی: کاتێ مسوڵمانانی بێ دەسەڵاتی مەککە ئەزیەتو ئازاردانیان زیادی کرد لەسەر دەستی هاوبەشدانەرانی قوڕەیش هاتنە لای پێغەمبەری خوا لەو کاتەدا لە ژێر سێبەری کەعبەدا داتیشتبوو، پێیان گوت: ئایا داوای سەرکەوتنمان بۆ ناکەی، ئایا بۆ مان ناپاڕێیتەوە لە خوا؟ پێغەمبەری وا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: {قَدْ كَانَ مَنْ قَبْلَكُمْ يُؤْخَذُ الرَّجُلُ فَيُحْفَرُ لَهُ فِي الْأَرْضِ فَيُجْعَلُ فِيهَا فَيُجَاءُ بِالْمِنْشَارِ فَيُوضَعُ عَلَى رَأْسِهِ فَيُجْعَلُ نِصْفَيْنِ وَيُمْشَطُ بِأَمْشَاطِ الْحَدِيدِ

**مَا دُونَ لَحْمِهِ وَعَظْمِهِ فَمَا يَصُدُّهُ ذَلِكَ عَنْ دِينِهِ، وَاللَّهِ لَيَتِمَّنَّ هَذَا الْأَمْرُ حَتَّى يَسِيرَ الرَّاكِبُ مِنْ صَنْعَاءَ إِلَى حَضْرَمَوْتَ لَا يَخَافُ إِلَّا اللَّهَ وَالذِّئْبَ عَلَى غَنَمِهِ وَلَكِنَّكُمْ تَسْتَعْجِلُونَ}** أَخْرَجَهُ البُخَارِي: برقم (٦٩٤٣).

واتە: لە پێش ئێوەدا کەسانێك هەبوون زەویان بۆ هەڵدەکەنراو زیندەبەچاڵ دەکران، وە بە مشار لەسەریەوە دەکرا بە دوو پارچە، وە بە نووکی ئاسن گۆشتو ئێسکەکانی لێك جیا دەکرایەوە، ئەمانە هیچی نەدەبوونە هۆی ئەوەی لە دینەکەی پاشگەزی بکەنەوە، سوێند بەخوا! خوا دینەکەی خۆی تەواو دەکات تاوای لێدێت سواریی لە صەنعاوە بەرەو حەزرەمووت بەرێگادا دەروات جگە لە خواو، لە مێگەلە گورگ نەبێ بۆ مەڕەکانی لە هیچ شتێکی تر ناترسێ، بەڵام ئێوە پەلەتانە.

پێشینانی ئێمە لە هاوەڵانو شوێنکەوتووانیان کاتێ ئەم ئامۆژگارییە قورئانیانەو ئەو ڕێنماییانەی پێغەمبەری خوایان صلی الله علیه وسلم دەربارەی ئامادە کردنی ئیمانداران بۆ ڕۆژانی تاقیکردنەوەو بەڵاو میحنەت بیستو فێری بوونو زانیان، ئەوانیش خۆیان ئامادە کرد بۆ سەباتو ئارامیو قوربانیی دان..

خاوەن نەفسێکی پڕ لە ئیمان بوون کە ترس داینەگرێ لە ڕووداوەکانی شەوگار، وە دڵی خۆڕاگریشی نەلەرزێ لەبەردەم پێشهاتەکانی ڕۆژگار، بۆیە بینیمانن پاش ئەوەی لە پەیامی مسوڵمانێتیو بەرپرسیارێتی بانگخوازیو گرنگی تێکۆشان گەیشتن، دەرچوون بۆ مەیدانی بانگخوازی بێ ئەوەی گوێ بدەنە لەمپەرەکان، وە بێ ئەوەی سارد بنەوە بە هۆی ئەو بەڵاو ناخۆشیانە هاتە بەردەمیان.

**هەندێ نمونەی مێژوویی**[٦]:

بۆ ئەوەی بانگخواز بەڕوونی بزانێ باپیرانی سەربەرزو بەشکۆمان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چ نارەحەتیو زەحمەتیەکیان تووش هاتووە لە پێناوی گەیاندنی پەیامی ئیسلامیو بانگەوازی خوایی، بەلکو جیلی ئێمە بە تایبەت گەنجەکانمان ئەو ئارامیو صەبرەی ئەوان بکەینە پەیڕەوو مەنهەجی ژیانمان بە تایبەت لە بواری بانگخوازی، وە ڕێگەی ئەوان بگرینە بەر لە قوربانی دانو خۆڕاگری، بۆ ئەوەی هەر لە دونیا عیززەتو ڕێزو شکۆیان بۆ بگەڕێتەوە...

* **ئەمە بیلالە خوا لێی ڕازی بێ:** ئەو ئیمانداره ئارامگرەی لە پێناو بانگەوازی کردندا بە چەندەها شێوە ئازار درا، هەرچەندە زیاتر ئازارو ئەشکەنجەیان دەداو بەردی گەورەیان لەسەر سکی دادەنا لە نیوەڕۆی زۆر گەرمدا لەسەر زەوی زیاتر ئیمانی بەهێزتر دەبوو زیاتر جێگیر دەبوو لەسەر دینی خوای بەرز، لە ناخەوە دەیگوت: (أحدٌ، أحَد، فَرد الصَّمد)!!

* **ئەمە عەممارە خوا لێی ڕازی بێ:** دایکی ناووی سومەییەیەو باوکیشی یاسر خوا لێیان ڕازی بێ، ئارامیان لەسەر شتانێك گرت ئینسان ناتوانێ ئارامی لەسەر بگرێ، وە کاتێ بەنو مەخزوم بە ئیسلام بوونی ئەوانیان زانی توندرین سزاو ئازاریان دان، بۆ ئەوەی دووبارە کافر ببنەوە، لە بەتحا کە شوێنێکە لە شاری مەککە خێزانی یاسر چەند ڕۆژێکیان لە نێو ئەو ئازارو ئەشکەنجەیەدا بەسەر برد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەلایاندا تێپەڕی لەو کاتەی کە سزا دەدران،

---

٦) ئەم نمونانەمان لە کتێبەکەمان (إلى ورثة الأنبياء) هێناوە.

پێغەمبەری خوا سەیری ئاسمانی کردو بانگی کرد: {**اصْبِرُوا آلَ يَاسر فَإِنَّ مَوْعِدكُمُ الجَنَّةَ**} أَخْرَجَهُ الطبراني برقم: (٧٦٩)، قال الهيثمي: رجاله ثقات.
واتە: ئارام بگرن ئەی خاوو خێزانی یاسر چاو پێکەوتنی ئێوە لە بەهەشتە، ئەوانیش ئەو بانگ کردنەی پێغەمبەری خوایان صلی اللە علیە وسلم بیست دەروونیان ئارام بۆوەو دڵیان سوکنایی بۆ هات، کاتێ ئەبو جەهل نەفرەتی خوای لێبێ هاتە لایان، سومەییەی خوا لێی ڕازی بێ شەهید کرد، بووە یەکەم شەهید لە ئیسلام، پاشان بە دوای ئەودا یاسریشی شەهید کرد، یاسریش بووە یەکەم شەهیدی پیاو لە ئیسلامدا، تەنها عەممار مایەوە، ئەو پەڕی ئەشکەنجەو ئازاریان پێ گەیاند ئەویش ئارامیی زۆری گرت تا وای لێهات ئەوەی لە توانای بوو ئارامی گرت، لە هۆش خۆی چوو، ئازارەکە بەشێوەیەك بوو ناچار بوو بە شێوەیەکی ڕواڵەتی وشەیەکی کوفر بڵێ بۆ ئەوەی وازی لێبێنن، بەڵام دڵی پاکی هەر بەو پەڕی ئیمانو یەقینەوە مایەوە، خوای پەروەردگاریش دەربارەی عەممار ئەو ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَـٰنِ ١٠٦ ﴾ النحل. واتە: مەگەر کەسێك زۆری لێ کرابێت دڵیشی دامەزراو بێت بە باوەڕ.

* **ئەمەش موصعەبی کوڕی عومەیرە خوا لێی ڕازی بێ:** گەنجێك لەنێو نازو نیعمەتو خۆشیدا گەورە بووبوو، گوێ لە بەسەرهاتی مسوڵمان بوونی بگرە وەك (إبن سعد) لە (طبقات)ەکەیدا هێناویەتی: (موصعەب یەکێ بوو لەو گەنجانەی مەککە لەو پەڕی گەنجێتیو جوانیدا بوو، دایكو باوکی زۆر خۆشیان دەویست، دایکی سامانێکی زۆری هەبوو، باشترینو بە نرخترین پۆشاکی لەبەر کوڕەکەی دەکرد، وە موصعەب بۆنخۆشترین کەسی نێو مەککە بوو، نەعلی حەزرەمی لەپێ دەکرد، "دیارە ئەو کات ئەو جۆرە زۆر بە نرخ بووە"، پێغەمبەری خوا لە ماڵی

ئەرقەمدا بانگی كرد بۆ ئەوەی مسـولّمان بـێ، موصـعەبیش هاتـە نێـو ئیسـلامو باوەڕی هێنا، هاتە دەرێ مسوڵمان بوونەكەی خۆی شـاردەوە، لـە ترسـی دایكـیو گەلەكەی، پاش ئەوەی ئاشكرا بـوو گرتیـانو بەنـدیان كـرد، هـەر بەبەنـد كـراوی مایەوە هەتا كۆچی حەبەشە، پاشان لەگەڵ مسـولّمانان گەڕایەوە).

خەبابی كوڕی ئەرت دەڵێ: (ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیـە وسـلم هیجرەتمان كرد، لە پێناوی خوادا، كارمان كەوتە سـەر خـوا، موصـعەب لـە ڕۆژی ئوحوددا شەهید كرا، هیچ قوماشێكی ئاوامان پێ نەبوو بتوانین كفنی پـێ بكـەین، قوماشێكی كەم نەبێ كاتێ سەرمان پێی دادەپۆشی پێیەكانی بەدیار دەكـەوتن، وە كاتێ پێیەكانمان دادەپۆشی سەری بە دیار دەكەوت، پێغەمبـەری خـوا صـلی اللـە علیە وسلم فەرمووی: (قوماشەكە لای سەری پێ داپۆشـنو پێیـەكانی بـە شـتێكی دیكە داپۆشن، پاشان بەدیاریەوە گریاو فەرمووی: (تۆم دەبینی لە مەككـە، كـەس هێندەی تۆ پۆشتەو بۆن خۆش نەبوو، كەچی ئێستا سەرت تۆزاوی بووە لە ژێـر ئـەم پارچە قوماشە بوردەیەدا، پاشان ئەو ئایەتەی بەسـەریەوە خوێنـد: ﴿ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُواْ مَا عَـٰهَدُواْ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُواْ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾ ﴾ الأحزاب.

واتە: لە ناو باوەڕداراندا پیاوانێك هەن ڕاستیان كرد لەو پەیانەی كـە دابوویـان بـە خوا ئنجا هەندێكیان نەزرو بەڵێنی خۆی بەجێ هێنا، (شەهید بوو) هەندێكیشـیان چاوەڕوانن هیچ گۆڕانێكیشیان (لە بەڵێنی خۆیان)دا نەكردوە.

هیچ گومانی تێدا نییە ئەو ئارام گرتنە زۆرەی موصـعەب لـە پێغەمبـەری خـواوە صلی الله علیە وسلم فێری بووەو وەری گرتووە، چـونكە هـەر پێغەمبـەری خوایـان صلی الله علیە وسلم كردبووە چاوساغو پێشەوای خۆیان.

* شوێنکەوتوانی ئەوانیش هەر لەسەر ڕێگای ئەوان ڕۆیشتوونو، ئەم کاروانە هەر بەردەوامە، هەتا سەردەمی ئێستامانو پاشی ئێمەش هەر بەردەوام دەبێ، وەکو پێشەوا ئەحمەدو، ئیبن تەیمیەوە، مونزیری کوڕی سەعیدو، سەعیدی کوڕی موسەییبو، والی کوڕی تاووسو، حەسەن بەنناو، سەیید قوتبو، شێخ مەڕوان حەدیدو، شێخ عەبدولعەزیز بەدریو، سەدانو هەزارانی دیکەش، دەتوانی دەیان نموونە لە صەبرو خۆڕاگری ئەو پیاوانە بهێنیتەوە، ڕەحمەتی خوایان لێبێ، خوای پەروەردگار پلەو پایەیان بەرز بکاتەوە.

ئەوەی لە پێشەوە باسمان کرد بە کورتیی:
ئەوانەی خەریکی کاری بانگخوازین، لەسەر ڕێگەی هیدایەتو گۆڕانکاریی ڕێ دەکەن، هیچ گومانی تێدا نیە دەبێ تووشی زەحمەتیو مەینەتو ناخۆشیی ببن، دەبێ ململانێ لەگەڵ خۆشیو ناخۆشیەکانی ژیان بکەن، ئەو کەسە بەهەڵەدا چووە کە وابزانێ ڕێگای دەعوە فەرش کراوە بە گوڵو ڕەیحان، بەڵکو بانگخواز لەسەریەتی بزانێ ئەم ڕێگای بانگەوازە بە بەردی گەورەو ڕەق فەرش کراوە، وە بە دڕکو داڵی وشکو ئازارگەیەنەر داپۆشراوە، ئەگەر خۆی لەسەر ئارام گرتنو تەحەمول کردن ڕانەهێنێ ئەوە لە یەکەم تاقیکردنەوەدا دەکەوێو بەجێ دەمێنێ، ناتوانێ بەردەوام بێ.
(أبو طیب المتنبي) گوتوویەتی:

ذَرِيني أَنَلْ ما لا يُنَالُ مِنَ العُلَى  فصَعْبُ العلى في الصّعب وَالسهلُ في السهلِ

واتە: لێم گەڕێ با بگەم بەو بەرزییەی کە پێی ناگەیشترێ، گەیشتن بەبەرزیی لە ناخۆشییدایە، وە گەیشتن بە سادەیی‌و حەز نەکردن بە بەرزیی ئەوە هەر لە سادەیی‌و ئاسانی دایەوە ئەمەیان بە ئاسانی دەست دەکەوێ.

هەروەها خاوەنی ئەم دێڕەش زۆر ڕاستی گوتووە:

وإذا كانتِ النُّفُوس كباراً تعِبَت في مُرادها الأجسامُ.

واتە: ئەگەر نەفس بیەوێ بەرزو گەورە بێ، بۆ گەیشتن بەو ئامانجە لاشە ماندوو بێ.

## گەشبینیی

گەشبینیی هێزێکی باشی دەروونــی کاریگــەرە، خاوەنەکــەی زەردەخەنــەو هیــواوە دەڕوانێتە بەیانی، بۆ گەیشــتن بــەو مەبەســتەش کــە داوای دەکــات بــە گیــانێکی قیادییو ئازایەتییەوە ڕێ دەکا، بەهۆی ئــەو گەشــبینیەوە خــۆی لــە بــێ ئومێــدی دەپارێزێ.

ئەوە ڕاستە کە وڵاتانی ڕۆژئاوا بە تایبەت ئەمریکا، ئیســڕائیلیان دروســت کــردوە، ئەوەش ڕاســتە کــە داگیرکــەر هۆکــارو فاکتــەری بــە هێــزی خــۆی هەیــە بــۆ دوور خستنەوەی مسوڵمانان لە ئیسلامو هاندانیان بۆ چــوونە نێــو ئیلحــادو لایەنــە بــێ دینەکان، ئەوەش ڕاستە کە شیوعیەتی جیهانی پلانی هەیە بۆ بــە ئیلحــاد بردنــی مسوڵمانانو درووست کردنی گومان لە دڵیاندا، بۆ تێکــدانی عەقیــدەیان، ئــەوەش ڕاستە کە یەهودیی جیهانی پلانو شێوەو شێوازی جۆراو جۆریان هەیــە بــۆ لــە نــاو بردنــی هــەموو دینێکــی دیکــەی غــەیری خۆیــان، وە کــۆنترۆڵ کردنــی جیهــانی ئیسلامیی، وە ڕاستیشە کە زۆربەی وولاتان لە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئــاوا بــەردەوام لــە هەوڵی بە هێز کردنی ئیسڕائیل دان، وە سوورن لەســەر بــوونی ئیســڕائیل لــە بــەر چەند مەبەستێکی سیاسی خۆیان، وە لەبــەر چــەند ئامــانجێکی ئــابوری، وە چــەند بەرژەوەندییەکی زاتی، وە بەڵێ ڕاستیشە کە پیلانو ئــاژاوەگێڕی لەســەر ئیســلامو مسوڵمانان گەیشتۆتە چڵەپۆپە، بەڵام پێویستە ئەمە وا لە بانگخواز نەکات تووشی بێ ئومێدیو ڕەش بینی بێ لە بونیات نــانی عیــززەتو ســەربەرزی، وە نــابێ بــێ ئومێدی بەسەریدا زاڵ بــێ لــە جێبــەجێ کردنــی ئامانجــەکانی بــۆ بــەدی هێنــانی سەرکەوتن.

بانگخوازی ڕێگەی خوا، زۆر لە پێشترە بەوەی خۆی بە سیفەتی ئومێدو هیواوە برازێنێتەوە بۆ سەرخستنی دەعوەکەی، وە ئەو لە هەموو کەس شایستەترە وەسف بکرێ بە کەسێکی گەشبینو بەرچاو ڕوون بۆ بەهێز کردنی دینی خوا، لەبەرچی؟

- لەبەر ئەوەی قورئان بێ ئومێدیو ڕەش بینی حەرام کردوە، وە سەرزەنشتی کەسانی بێ ئومێدو ڕوشبینی کردوە.

- وە مێژوو بەڵگەی ئەوە دەدەنە دەست کە میللەتان ڕاپەڕیون دژی ئەوەی کە هاتۆتە سەریانو بێ ئومێد نەبوونەو دەستە پاچە سەیری بکەن.

- وە لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا صلی اللـه علیه وسلم مـوژدەی بە ئۆمەتی ئیسلام داوە بە وەی کە دەبنە ئۆمەتێکی عەزیزو خاوەن کیان.

*** هەرچی قورئانی پیرۆزە ڕەش بینیو بێ ئومێدی حەرام کردوە:**

لەو ئایەتانەی کە بە ڕوونی ئەمەمان پێ دەڵێن:

- خوای پەروەردگار بێ ئومێدییو ڕەش بینی کردۆتە نزیکی کوفر وەك دەفەرمووێ: ﴿ ... وَلَا تَاْيْـَٔسُواْ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَا يَاْيْـَٔسُ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٨٧﴾ ﴾یوسف.

واتە: وە نائومێدیش مەبن لە میهرەبانییو بەزەیی خوا بە ڕاستی نائومێد نابێ لە ڕەحمو میهرەبانی خوا جگە لەوانەی کە بێ باوەڕن.

- لە ئایەتێکی دیکەدا یەئسو ڕەشبینی کردۆتە قەرینەی گومراییو سەرلێشێوان، وەك دەفەرموێ: ﴿ ...وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ ﴿٥٦﴾ ﴾ الحجر.

واتە: جا کێ لە میهرەبانیی پەروەردگاری نائومێد دەبێ مەگەر گومرایان؟

- لەو ئایەتێکی دیکەدا مرۆڤ ئاگادار دەکاتەوە لە ڕەشبینی، وەك دەفەرموێ:

﴿ وَإِذَآ أَذَقۡنَا ٱلنَّاسَ رَحۡمَةٗ فَرِحُواْ بِهَاۖ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةُۢ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ إِذَا هُمۡ يَقۡنَطُونَ ٣٦ ﴾الروم.

واتە: وە کاتێك ڕەحمەتو چاکەیەك بە خەڵك بدەین پێی دڵخۆش دەبن، وە ئەگەر زیانێکیان تووش بێ بە هۆی کردەوەی خراپیانەوە، کوتو پڕ بێ هیوا دەبن لە (بەزەیی خوا).

لەو دەقە قورئانیانەی سەرەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ: ڕەشبینی لە دینی خوا حەرامەو درووست نیە، چونکە ڕەشبینی پیاو دەکوژێ، وە ئازاکان ژێر دەخات، وەك بوومەلەرزە وایە بۆ میللەتان، هیواو ئاواتەکان تێكو پێك دەشکێنێ، لەسەر بانگخواز پێویستە وریا بێ لەو بۆچوونو قسە نەشیاوەی کە دەڵێ: (هەموو شتێك کۆتایی هاتو نەمانتوانی)، یاخود دەڵێ: (دەست بە دەرگاکەی خۆتەوە بگرە، لە بانگخوازیو تێکۆشاندا هیچ سوودێك نیە)، یاخود ئەو قسەیەی کە باوە لەنێو خەڵکیو دەڵێ: (خۆتو کردەوەی خۆت، خەڵك چی دەکات با بۆخۆی بیکات وازیان لێ بێنە).

قورئان ناوی لەم جۆرە کەسانە ناوە ناکامو بە زەویەوە نووساو، وەك دەفەرموێ:

﴿ قَدۡ يَعۡلَمُ ٱللَّهُ ٱلۡمُعَوِّقِينَ مِنكُمۡ وَٱلۡقَآئِلِينَ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ هَلُمَّ إِلَيۡنَاۖ وَلَا يَأۡتُونَ ٱلۡبَأۡسَ إِلَّا قَلِيلًا ١٨ أَشِحَّةً عَلَيۡكُمۡۖ فَإِذَا جَآءَ ٱلۡخَوۡفُ رَأَيۡتَهُمۡ يَنظُرُونَ إِلَيۡكَ تَدُورُ أَعۡيُنُهُمۡ كَٱلَّذِي يُغۡشَىٰ عَلَيۡهِ مِنَ ٱلۡمَوۡتِۖ فَإِذَا ذَهَبَ ٱلۡخَوۡفُ سَلَقُوكُم بِأَلۡسِنَةٍ حِدَادٍ أَشِحَّةً عَلَى ٱلۡخَيۡرِۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَمۡ يُؤۡمِنُواْ فَأَحۡبَطَ ٱللَّهُ أَعۡمَٰلَهُمۡۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا ١٩ ﴾الأحزاب.

واتــە: بێگومــان خــوا بــەو کەســانەتان دەزانــێ کــە ســاردکەرەوەو گەڕێنــەرەوەی (مسـولْمانانن لە جیهاد)، کە بە برادەرەکانیان دەڵێن: وەرن بۆ لای ئێمــە (و خۆیــان دەدزییەوە لە جیهاد) ئەوانە نایەن بۆ جەنگو غەزا زۆر بە کەمی نەبێ، لە ئاسـتی ئێوەدا (مسـولْمانان) چرووکن، ئنجا کـاتێ (بـەهۆی جەنگـەوە) تـرس‌و بـیم پەیـدا دەبێ، دەیانبینی بەجۆرێك سەیرت دەکەن (لە ترسی جەنگ) چاویان بەم لاو ئـەلادا دەسووڕێ، بەوێنــەی کەســێ لەســەرەمەرگدا بێهۆشـیی بەسـەردابێ، بـەلاّم کـاتێ ترســەکە ڕۆیشــتو نــەما بــە زمــانی تیــژ زمانتــان لــێ درێــژ دەکــەن، (وە داوای غەنیمەتتان لێ دەکەن) کەچی چرووك‌و ڕژدن لەسەر مــاڵو غەنیمــەت، ئــا ئەوانــە باوەڕیان نەهێنابوو، بۆیە خوا کردەوەیانی پوچەڵ کردەوە، وە ئەمە بـەلای (خــواوە) کارێکی ئاسانە.

ئەو کۆمەڵە ڕەش بینیو بێ ئومێدە کاتێ ئـەم ڕووە بێئومێـدو ڕەشـبینە بونیـات دەنێن، بەر لە هەموو کەسێکی دیکە بەڵگەیە لەسەر بەهیلاك چوونی خـۆی، نــەك بەهیلاك چوونی مسولْمانان، پێغەمبەری خوا صـلی الله علیــە وسـلم دەفــەرموێ: {إِذَا قَالَ الرَّجُلُ هَلَكَ النَّاسُ فَهُوَ أَهْلَكُهُمْ} أَخْرَجَهُ مُسْلِم بـرقم (٢٦٢٣).

واتە: ئەگەر پیاوێك گوتی: خەڵکی هەموو بە هیلاك چوون، خۆی لە لــە هــەموویان زیاتر بەهیلاك چووە.

ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کۆمەڵێك لـەو کەســە بــێ هێــزو لاوازانــە کــە خۆیان داوەتە پاڵ زانستو زانایان داوای دوور بوون لە خــەڵکی دەکـەن داوای دوورە پەرێزی دەکەن، وە پێیان باشە لە ماڵەکەی خۆتدا بیتو تەنها ئاگاداری خۆت بــی، پێیان وایە هیچ ڕێگایــەك نییــە بــۆ چاکســازیو پاکســازی کردنــی کۆمــەڵگا، وە ناتوانرێ گەورەیی‌و ڕێز بۆ ئەو ئوممەتە بگەڕێتەوە، وە هیچ ئومێــدو هیوایــەك نیــە،

ئێستا کاتی ئەوەیە کە مسولّمان خۆیو چەند پاروو نانێکو پێویستیەك پەنا بۆ چۆڵەوانییو ئەشکەوتو ناو چیاکان ببات بەو دینداریەی هەیەتی سەری خۆی هەڵبگرێ، تاوەکو مردن دەیگاتێ!!

ڕاستە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: **{يُوشِكُ أَنْ يَكُونَ خَيْرَ مَالِ الْمُسْلِمِ غَنَمٌ يَتْبَعُ بِهَا شَعَفَ الْجِبَالِ وَمَوَاقِعَ الْقَطْرِ يَفِرُّ بِدِينِهِ مِنْ الْفِتَنِ}** أخرجه البخاري برقم: (٧٠٨٨).

واتە: هێندەی نەماوە باشترین ماڵی مسولّمان چەند سەر ئاژەڵێك بێو لەدوایانەوە بەرەو قەدپاڵی چیاکانو لەوەڕگاکان بچێو خۆیو دینەکەی هەڵبێ لەبەر فیتنە (فیتنەی ئەو ڕۆژگارەی کە تێیدا دەژی). بەڵام زانایانی شیکەرەوەی فەرموودە گوتوویانە ئەمە بۆ کەسێکە بکەوێتە حاڵەتێکەوە فیتنەکە بە شێوەیەك بێ مەترسی هەڵگەڕانەوە (ڕیددە)ی لێ بکرێ[٧].

---

٧) هەموو ئەو فەرموودانەی باسی دوورە پەرێزی (العزلة) دەکەن، مەحموولن لەسەر ئەوەی ئەو کەسە تووشی فیتنە بێ لە دینەکەیو مەترسی هەڵگەڕانەوە بکات، وە کەسی تووش بوو بە فیتنە هیچ هۆکارێکی چاکسازی پێ نەمابێ، وە نەتوانێ هیچ گۆڕانکارییەك بکا، ئەم دیاردەیەش لە نیشانەکانی ڕۆژی دواییە، چونکە قیامەت کاتێك دێ کەسێ لەسەر زەوی نەمابێ بڵێ: (الله، الله)، بەڵکو قیامەت لەسەر کەسانێ هەڵدەستێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ناوی لەو کەسە ناوە: (لكع بن لكع) واتە: بێ نرخی کوڕی بێ نرخ، هەروەك لە فەرموودەدا هاتوە.

بەڵام هەرچی ئێمەین مادام لە خاكێكدا دەژیـن خەڵكەكـەی مسـوڵمانو درووشمـە دینیەكانی خوا بەرز ڕادەگرنو جێ بەجێی دەكەن، ئەحكامەكانی ئیسلام جێبـەجێ دەكەن، وە مادام دەرفەتێك هەیە بۆ یارمەتی دانی یەكتر، كەواتە درووسـت نییـەو حەرامە مسوڵمان خۆی دوورە پەرێز بكات، چونكە ئەوەی كە پێویسـتە بـۆ ئـەوەی واجبێكی پێ تـەواو بـێ، ئـەویش دەبێتـە واجـب، لەبـەر ئـەوە پێویسـتە لەسـەر مسوڵمان تێكڕایان حوكمی خوا لەسەر زەوی بەرپا بكەن، وە پابەندبن بـە كۆمـەڵی مسوڵمان، لەسـەر ڕێگای تێكۆشانو خۆماندوو كردن بەرەو پـێش بـڕۆن بـەو پـەڕی متمانە بەخۆبوونو گەشبینیەوە.

* مێژوو بەڵگەی زۆری تێدایيە لەسەر ڕاپەڕینی ئوممەتان سەرەڕای تووش بوونیان بەزەلیلیو بێ هێزبوونیان:

ئەمە كۆمەڵێك بەڵگەی مێژوویین[٨]:

أ- پـاش ئـەوەی پێشـەوا ئـەبو بـەكر خـوا لێـی ڕازی بـێ جێنشـینیی وەرگـرت، بارودۆخەكە لەو پەڕی ناخۆشیو نالەباریی دابوو، دووڕووان بـە شـێوەیەكی بەرچـاو ڕۆڵیان دەركەوت، ئەوەی هەڵگەڕایەوە هەڵگەڕایەوە لە لادێنشـینە عەرەبـەكان، وە خەڵكانێك پەیدا بوون بانگەشەی پێغەمبەرایەتییان دەكرد، وە خـەڵكانێكی دیكـە پەیدا بوون ڕەتیان كردەوە زەكاتی ماڵی خوا بدەن، جومعە لـە هـیچ شـارێك نـەما غەیری شارەكانی مەككەو مەدینە، مسوڵمانان وایان لێهات وەك (عـورِوەی كـوڕی زوبەیر) خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: (مسـوڵمانان وەكو مـەڕیان لێهـات لـە شـەوێكی باراناوی تاریكی زستاندا، لەبەر لە دەستدانی پێغەمبەرەكەیان خوا صلی الله علیـە

---

٨) هـەموو بەڵگـە مێژوویانـەمان لـە كتـێبی (الإسـلام والقضـیة الفلسـطینیة) خواستۆتەوە (هی دانەر خۆیەتی)، ص ٨٣- ٨٥.

وسلم، وە لەبەر کەمی مارەیانو زۆری دوژمنەکانیان)، هەتا هەندێك لە مسولمانان بە پێشەوا ئەبو بەکریان گوت: (ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم: دەرگاکەت پێوەدە، لە ماڵەکەتدا بێنەوە، پەروەردگاری خۆت بپەرستە هەتا مردن دەتگاتێ).

بەڵام بە پێچەوانەوە ئەبو بەکر خوا لێی ڕازی بێ بێ ئومێدی بەسەریدا زاڵ نەبوو، ڕەشبینی نەیتوانی گەمارۆی بدات، ڕووبەڕوی هەموو ئەو پێشهاتو ناڕەحەتییانە بوویەوە بەئیمانێکی قووڵ، بە عەزیمەتێکی پتەو، بە گەشبینیەکی مەزنەوە، ئەوە کە قسەیەکی فەرمووە تا دونیا مابێ ئەو قسەیەی نامرێ لە نێو ئەو هەموو زەحمەتیو تاریکییەوە فەرمووی: (**أَينقص الدِّين وأَنا حَيٌّ؟**) واتە: دین بەرەو کورتییو لەناوچوون بڕواو منیش زیندووبم؟

ئەوەتا هەر ئەبو بەکرە خوا لێی ڕازی بێ لەو بارودۆخە شلۆقەدا کاتێ عومەری کوڕی خەتتاب دێتە لایو سەرکۆنەی دەکات لەسەر بڕیاردانی شەڕ دژی ئەوانەی کە ڕەتیان کردەوە زەکات بدەن، بە عومەر خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: (عومەر! ئەوە چیتە، بێدەنگبە، داوای سەرخستنت لێ دەکەم، تۆش بە حەجاڵەتی دێیتە لام؟ تۆیەك بە زەبری بووی لە جاهیلیەتو بێ دەستی لە ئیسلام؟ سوێند بە خوا تا شمشێر لەدەستم بێ جیهادیان لەگەڵ دەکەن، سوێند بە خوا جەنگ لەگەڵ ئەوانەدا دەکەم کە جیاوازی دەکەن لەنێوان نوێژو زەکات، سوێند بە خوا ئەگەر ڕێگریم لێ بکەن بە پێدانی ئەو گوریسەی کە بەملی ئاژەڵەکانیان وە دەکەن کە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا داویانە، لەسەر ئەوە جەنگیان لەگەڵ دەکەم).

عومەر خوا لێی ڕاوی بێ گوتی: (ئەمە شتێك نەبوو جگە لەوەی وای دەبینم خـوای پەروەردگار دڵی ئەبو بەکری خوا لێی ڕازی بێ کردەوە بۆ ئەم جەنگە، زانیم کە ئـەو لەسەر حەقە).

هەر ئەبو بەکر بوو خوا لێی ڕازی بێ لەو بارودۆخە دژوارەدا سوپای ئوسامەی بەڕێ کرد، بەو کەسانەشی گوت کە بەرهەڵستی ئەو کارەی ئەویان کرد: (سـوێند بـەوەی گیانی ئەبو بەکری بە دەستە، ئەگەر بزانم بەم کارە دێوو درنج دەمرفێنن ئـەم کـارە هەر دەکەم، وەك چۆن پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەر لە وەفـاتی بڕیـاری بەڕێ کردنی سوپاکەیدا، ئەگەر ئەم شارە کەسی تێـدا نـەمێنێ جگـە لـە خـۆم بـە تەنیا بکەوم هەر دەیکەم، گرێیەك ناکەمەوە پێغەمبەری خوا گرێی دابێ).

بەردەوام ئەبو بـەکر خـوا لێـی ڕازی بـێ پلانـی دەکێشـا، تێدەکۆشـا، نوێنـەرانی دەناردن، شەونخونیی دەکرد لە پێناو بەرژەوەنـدی خەڵکەکـەی، تـا ئـەوەبوو تـوانی بەسەر هەموو ئەو زەحمەتیانەدا زاڵ بـێ، بەسـەر هـەموو ئەوانـەدا سـەرکەوێ کـە پیلانیان بۆ مسـوڵمانان دەکێشا، فیتنەو ئاژاوەیان دەنایـەوە، وە سـەرکەوت بەسـەر هەڵگەڕاوەکان، وە بەسەر ئەو کەسانەدا کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتیان دەکـرد، وە ئەوانەی کە قەدەغەی زەکاتیان دەکرد، وە ئەوانەشی کە نوێژیان بە تاڵ کـردەوە، وە تـوانی شـکۆ بـۆ مسـوڵمانان بگەڕێنێتـەوە، وە تـوانی ئومێـد بـۆ بـێ ئومێـدان بگەڕێنێتەوە، وە دەوڵەت بۆ ئیسـلام بژێنێتـەوە، وە هەیبـەتو ڕێـز بـۆ خیلافـەی ڕاشیدین بێنێتەوە.

پیاوە گەورەکانو ئیمان پتەوەکان ئاوایان کردوە!!

ب- پاش ئەوەی هەندێ لە مسوڵمانانو غـەیری مسـوڵمانانیش گومانیـان هـەبوو لەوەی جارێکی تر مسوڵمانان بتوانن مزگـەوتی ئەقصـا لـە ژێـر دەسـەڵاتی خـاچ

پەرستان دەربهێنرێتەوە، خاچ پەرستان ئەو کاتە توانیبویان زۆربەی خاکی مسوڵمانان بخەنە ژێر دەستی خۆیانو داگیری بکەن، وە داگیر کردنی مزگەوتی ئەقصا بۆ ماوەی سەدەیەك، ئەمە وای لە زۆرێك لە مسوڵمانان کردبوو بە شێوەیەك بێ ئومێد بن بڵێن: هیچ ئومێدێكو هیوایەك نیە بۆ سەرکەوتنی مسوڵمانان بەسەر خاچ پەرستان، لە بەرانبەردا خەڵکانی دیکە هەبوون بۆچوونیان وابوو حەتمەن ڕۆژێك دێ ئازاد بکرێ، ئەوە بوو لەسەر دەستی پاڵەوانی خاوەن غیرەت (صلاح الدین) لە شەڕی (حطین)ی یەکلاکەرەوەدا توانی مزگەوتی خۆشەویستی ئەقصا ڕزگار بکات، پاش ئەوە مسوڵمانان بوونە خاوەنی سیادەو هێزو شکۆو خاوەن کیانی خۆیان.

پیاوە گەورەکانو ئیمان پتەوەکان ئاوایان کردووە!!

ج- هەندێ گومانیان وا دەبرد ئەگەر مسوڵمانان هەڵسوڕاوێكو خەم خۆرێکیان هەبووایە مەغۆڵو تەتەرەکان بەم شێوە وەحشیگەرییە نەیاندەتوانی خاكو خەڵکی مسوڵمانان لەو پەری بۆ ئەوپەری وێرانو خاپوور بکەنوماڵیان بەتاڵان ببەن، تا ئەو ڕادەیەی دەگوترێ هۆلاکۆ لە هێسکەپەیکەری لاشەی مسوڵمانان هەرەمی بەرزو چیای پتەوی لێ درووست کرد، مێژوونووس (إبن الأثیر) دەربارەی سەختی ئەو ڕۆژانە دەڵێ: (ماوەی چەند ساڵێك مامەوە نەمتوانی ئەو ڕووداوە گەورەیە بنووسمەوە، لەبەر گەورەییەکەی، ڕقم لەباس کردنی بوو، پێیەکم لەپێش بوو یەکێکم لە پاش دوو دڵ بووم لە نووسینەوەی ئەو مێژووە تاڵە، ئەوە بۆ کێ ئاسانە بتوانێ بەدەستەکانی خۆی لە ناو بردنی ئیسلامو مسوڵمانان بنووسێتەوە، کێیە

ئەوە باس کردنی ئەوەی لا ئاسان بێ؟ خۆزگە دایکم منی نەبووایە!! خۆزگە بەر لەوە بمردمایەو لە بیرکرابام!!)[٩].

کێ دەیزانیو گومانی دەبرد رۆژێك دێتە پێش وولاتی مسولمانان پاش ئەو رۆژە سەختو دژوارانە لەسەر دەستی پالەوان (مقدام) (قطز) ئازاد دەکرێ، لە جەنگی (عین جالوت)، مسولمانان عیززەتو سەربەرزییەکی ئەوتۆیان بۆ گەڕایەوە ئەوە دوای ئەوە شانازیی پێوە بکەن.

پیاوە گەورەکانو ئیمان پتەوەکان ئاوایان کردووە!!

ئەم سێ کارەساتە گەورەیە کە لە سێ چەرخی جیاواز روویانداوە، وە شۆڕشەکانی دیکەی ئۆممەتی ئیسلامی دوای لە پاش ئەو سێ رووداوە، خۆی لە خاڵێکدا دەبینێتەوە، ئەویش بریتییە لە بوونی سەرکردەوەیەکی ئیماندارە، خاوەن عەقیدەیەکی رۆچوو، خاوەن ئیمانێکی پتەو بێ بەو پەیمانەی خوای گەورە دەربارەی سەرخستنی مسولمانانو بەرەو پێش بردنی ئیسلامو گێڕانەوەی هێزو دەسەلات بۆی، سەرکردەیەك زۆر دەستی گرتبێ بە رێنماییەکانی ئیسلام، وە زۆر دەستگربێ بە ئادابو رەوشتە جوانەکانی ئیسلام، خۆی داماڵیبێ لە هەموو خۆویستیەك، وە سەکردەیەك بێ دوور بێ لە دەمارگیری نەزانیی، وە بجەنگن بە شمشێرەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم، ئەگەر ئەو جۆرە سەرکردەیە لەنێو مسولمانان هەبێ، ئەوە شایستەی سەرخستنی خوایی دەبن، وە شایستەی پالپشتیەك دەبن لەخواوە کە عادەتی پیوە نەگیرابێ، وە خوای پەروەردگار

---

٩) (الکامل) لإبن الأثیر، سەیری ئەو ئابڕوچوونە بکە کە مەغۆل دژی مسولمانان ئەنجامی دا.

موعجیزمیان بۆ دێنێتە دی، ئەوەتا دەفەرموێ: ﴿ ... أُوْلَٰٓئِكَ حِزۡبُ ٱللَّهِۚ أَلَآ إِنَّ حِزۡبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٢٢ ﴾ المجادلة، وە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ ٱلۡغَٰلِبُونَ ١٧٣ ﴾ الصافات، واتە: دیاریشە هەر سەربازانی ئێمە سەردەکەون.

گەشبین بوون بە سەرکەوتنی دینی خوا سەرەتای سەرکەوتنە، هێزی مەعنەویی هەر ئوممەتێك گەنجەکانی پاڵ پێوە دەنێ بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتنی زیاتر، لە هەموو کاتو شوێنێکدا، وە خوای گەورەش لەگەڵ پارێزکارانو نیازپاکانو تێکۆشەران دایە، ئەوانەی فەرمان بەشتە پەسەندەکان دەکەنو ڕێگریی لە شتە ناپەسندو خراپەکان دەکەن، وە ئەوانەی سنوورەکانی خوا دەپارێزن، ﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَنَجۡعَلَهُمۡ أَئِمَّةٗ وَنَجۡعَلَهُمُ ٱلۡوَٰرِثِينَ ٥ ﴾ القصص. واتە: وە ئێمە دەمانەوێ (بە چاکەی خۆمان) منەت بنێین بەسەر ئەوانەی کە لاوازو ژێر دەست کرابوون، لە ولاَتی (مصر)دا، وە بیانکەینە پێشەواو بیانکەینە میرات گران (ی کەلەپوری فیرعەونو شوێنکەوتووانی).

*** پێغەمبەری خواش صلی الله علیه وسلم مـوژدەی عیـززەتو ڕێـزی بـە ئوممەتی ئیسلام داوە:**

- پێغەمبەی خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: **{لا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي عَلَى الْحَقِّ ظَاهِرِينَ}** أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم (١٨٨٠٤). بەردەوام تائیفەیەك لە ئوممەتەکەم دیارن لەسەر هەق، لە ڕیوایەتێکدا هاتووە: **{لَنْ يَبْرَحَ هَذَا الدِّينُ قَائِمًا يُقَاتِلُ عَلَيْهِ عِصَابَةٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ}** أَخْرَجَهُ مُسْلِم برقم: (١٩٢٢)، وَابْنُ حِبَّان برقم: (٦٨٣٧). واتە: ئەو دینە بەردەوام لەسەر

پێی خۆی دەوەستێ، کۆمەڵێك لە مسوڵمانان شەڕو کوشتاری لە پێناودا دەکەن، تا ڕۆژی قیامەت.

ئەم فەرمایشتانە بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەن لەسەر بوونی کۆمەڵێك لە ئیمانداران لەسەر هەق، تا هاتنی ڕۆژی دوایی، وە ئەو کۆمەڵەو تایەفەیەش بەردەوام لە ململانێدان لەگەڵ باتیڵ، ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان نووری هەق شاررایەوە، هیچ گومانت نەبێ ڕۆژێکی دی ڕووناك دەبێتەوەو دووبارە سەرهەڵدەداتەوە، لە نێو تاریکاییەکانی بێ ئومێدییدا ڕووناکی ئومێدو هیوا دەدرەوشێتەوە.

- هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکەدا دەفەرموێ: {(**لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلُونَ عَلَى الْحَقِّ ظَاهِرِينَ، ولِعَدوهم قاهِرِين، لا يَضُرهُم مَن جابَهَهُم، ولا ما أَصابَهُم، مِنَ البَلاءِ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْر الله، وَهُمْ كَذَلِك) قَالُوا: يَا رَسُولَ الله: وَأَيْنَ هُمْ؟ قَالَ: (بَيْت المَقْدس)**} أَخْرَجَهُ البُخَارِي برقم (٣٦٤١).

ئەمە موژدەیەکە لەلایەن پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم کە ئیسلام هەردەبێ حوکم بکات، وە خاکی مزگەتی ئەقاصا هەر دەبێ ئازاد بکرێ، وە سەبەزیو شکۆمەندی هەر دەبێ بگەڕێتەوە بۆ مسوڵمانان.

- ئەبی قەبیلە دەڵێ: ئێمە لەلای عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِی کوڕی عاص دابووین، پرسیار کرا کامە لەم دوو شارە زووتر فەتح دەکرێ: قوستەنتینیە یاخود ڕۆمیی[١٠]؟ عەبدوڵڵا داوای سندوقێکی کرد بۆی بێنن، نووسراوێکی تێدا بوو دەری هێنا، پاشان گوتی: لەو کاتەی ئێمە لەدەوری پێغەمبەری خوا صلی الله

---

١٠) قوستەنتینیە: بیزەنتیە، یاخود (إستنبول)ی ئێستا، وەڕۆمییە: بریتیە لە ڕۆما پایتەختی ئێستای ئیتاڵیایە.

علیه وسلم بووین ئەو پرسارەمان نووسیەوە کاتێ لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کرا کامە شار بەر لە هەموویان فەتح دەکرێ؟ فەرمووی: شاری هرقل، واتە: قوستەنتینیە)[١١].

فەتحی یەکەم هاتە دی لەسەر دەستی سوڵتان (موحەممەد فاتیح)ی عوسمانی ڕەحمەتی خوای لێبێ، ساڵی (١٤٥٣)ز، واتە: (٨٠٠) ساڵ پاش هەواڵەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەتحی دووەمیش هەر دەبێ بێتە دی بە ئیزنی خوای بەرزو مەزن، پرسیار دەکەن ئەمە کەی؟ تۆ بڵێ: بەڵکو ئەمە زۆر نزیك بێ؟!!

- هەروەها لە فەرمایشتێکی دیکەدا هاتووە: {تَكُونُ النُّبُوَّةُ فِيكُمْ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ تَكُونَ ثُمَّ يَرْفَعُهَا إِذَا شَاءَ أَنْ يَرْفَعَهَا ثُمَّ تَكُونُ خِلافَةٌ عَلَى مِنْهَاجِ النُّبُوَّةِ فَتَكُونُ مَا شَاءَ اللهُ أَنْ تَكُونَ ثُمَّ يَرْفَعُهَا إِذَا شَاءَ اللهُ أَنْ يَرْفَعَهَا ثُمَّ تَكُونُ مُلْكًا عَاضًّا فَيَكُونُ مَا شَاءَ اللهُ أَنْ يَكُونَ ثُمَّ يَرْفَعُهَا إِذَا شَاءَ أَنْ يَرْفَعَهَا ثُمَّ تَكُونُ مُلْكًا جَبْرِيَّةً فَتَكُونُ مَا شَاءَ اللهُ أَنْ تَكُونَ ثُمَّ يَرْفَعُهَا إِذَا شَاءَ أَنْ يَرْفَعَهَا ثُمَّ تَكُونُ خِلافَةً عَلَى مِنْهَاجِ النُّبُوَّةِ} أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم (٢٧٣)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن.

واتە: پێغەمبەرایەتی لە نێوتان دەمێنێتەوە ئەوەندەی خوا حەز بکات، پاشان بەرزی دەکاتەوە، پاشان جێنشینیی (خەلافەت) پەیدا دەبێ لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر، ئەویش دەمێنێتەوە لە نێوتان ئەوەندەی خوا حەز بکات، پاشان ئەویش بەرز دەبێتەوە، پاشان پادشایەتی دێو ئەویش لە نێوتاندا دەمێنێتەوە ئەوەندەی

---

١١) سنن الدارمي (١/ ٩٢).

خوا بیەوێ، پاشان دەبێتە حوکمی خۆسەپێن، ئەویش دەمێنێتەوە ئەوەندەی خوا بیەوێ، پاشان بەرزی دەکاتەوە لەو کاتەی کە خوا بەخۆی دەیەوێ، لە کۆتایی دا دەبێتەوە بە خەلافەتی لەسەر رێبازو بەرنامەی پێغەمبەرایەتی.

ئەوەی کە تا ئێستا بووە لەو زنجیرە مێژووەدا، پادشایەتی کۆتایی هات بە کۆتایی هاتنی دەوڵەتی عوسمانی، ئێستا کاتی حوکمی خۆسەپێنییە، بەوە دەزانین کە حوکمی خۆسەپێنە دەبینین دێنە سەر دەسەڵات بێ گەڕانەوە بۆ خەڵك، ئیرادەی میللەت داگیر دەکەن، حوکمی دیکتاتۆری لەسەرەتادا لە تورکیا لەلایەن ئەتاتورك سەری هەڵدا، پاش ئەو لە هەموو شوێنەکان بە دوای ئەودا هاتن، بەڵام ئەو بەڵگانەی باسی هەڵسانەوەی ئیسلامان بۆ دەکەن موژدەیەکن بۆ ئێمە کە ئەو حوکمە هەرگیز بەردەوام نابێ، دەبێ ئەو رۆژە بێ حوکمڕانییەك درووست بێ لەسەر ئەو مەنهەجە بێ کە پێغەمبەری خوا لەسەری بووە، هاتنی ئەمەش ئینشائەڵلا نزیکە.

من زۆر گەشبینم بەوەی کە ئەمە هەر دێتە دی لەسەر دەستی بانگخوازان، بە یارمەتی خوا، وە بە هیممەتی گەنجانمان، بە تێکۆشانی زانایان، بە بەخشینی دەوڵەمەندان.

- هەروەها لە موژدەیەکی دیکەی پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم هاتووە: {**لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُقَاتِلَ الْمُسْلِمُونَ الْيَهُودَ فَيَقْتُلَهُمْ الْمُسْلِمُونَ حَتَّى يَخْتَبِئَ الْيَهُودِيُّ وَرَاءَ الْحَجَرِ أَوْ الشَّجَرَةِ فَيَقُولُ الْحَجَرُ أَوْ الشَّجَرُ يَا مُسْلِمُ يَا عَبْدَ اللَّهِ هَذَا يَهُودِيٌّ خَلْفِي فَتَعَالَ فَاقْتُلْهُ إِلاَّ الْغَرْقَدَ فَإِنَّهُ مِنْ شَجَرِ الْيَهُودِ**} أَخْرَجَهُ البُخَارِي برقم (٢٩٢٩).

واته: قیامەت نایێ تا مسوڵمانان لەگەڵ یەهودیەکان شەڕ نەکەن، یەهودی خۆی دەشارێتەوە لەپشتی دارێك یان بەردێك، ئەو دارە یاخود ئەو بەردە دەڵێ: ئەو مسوڵمان ئەوە یەهودیە لە پشتم وەرە بیکوژە، تەنها داری غەرقەد نەبێ، ئەو لە داری یەهودە.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەم فەرموودەیەدا هەواڵی ئەوەمان پێدەدا یەهود لە کاتێك لە کاتەکان دەگەنە ئەوپەڕی هێزو کۆنتڕۆڵ کردن، وە ئەوان لە یەك شوێندا کۆ دەبنەوە، پاشان مسوڵمانان زاڵ دەبن بەسەریاندا، هەموو شتێك بانگی مسوڵمان دەکات بەرد بێ یاخود دار.

ئەوەتا ئێستا ئەوان لە شوێنێکدا کۆ کراونەتەوە کە خاکی فەڵەستینە، بە ئیزنی خوا تێچوونیان لەسەر دەستی مسوڵمانانی ڕاستگۆو کڕنووش بەرو سوجدە بەر دەبێ، مسوڵمانانێك کە فەرماندەرن بە کاری پەسەندو ڕێگریکارن لە کاری ناپەسەند، وە پارێزگارن لە سنوورەکانی خوا.

ئەو ئیعجازەی لەم فەرموودانەدایە وەك چۆن بەشی یەکەمی دەربارەی کۆبوونەوەی یەهود لە خاکی فەڵەستیندا هاتۆتە دی، بە ئیزنی خوا بەشی دووەمی فەرموودەکەش هەر دێتە دی.

**بە کورتییەکەی ئەوەی پێشتر باسمان کرد:**

براو خوشکی بانگخواز ئەگەر ڕەشبینیو بێ ئومێدی لە دینی خوادا حەرام بێ، وە ئەگەر مێژوو پێمان بڵێ ئوممەتانی ژێر دەستەو لاواز لەو پەڕی بێ دەسەلاتیان ڕاپەڕینیان کردوە، وە ئەگەر پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم موژدەمان بداتێ بەوەی ئوممەتی ئیسلام سەرەڕای تووش بوونی بە بێ هێزیو پارچە پارچە بوونی بەڵام دەگاتەوە بەو پەڕی شکۆو ڕێزو سەربەرزی.

ئەگەر کارەکان بەم شێوەیەن بۆچی خەڵکی خۆیـان بـە بـێ ئومێـدیو ڕەش بـینی داپۆشیوە؟

ئەگەر کارەکە بەم شێوەیە بۆچی ژمارەیەکی زۆر لە مسـوڵمانان تووشی ترسو بێ هەڵوێستیو بوونە؟

پێویستە لەسەر تۆ براو خوشکی بانگخواز ئەو ڕێگەیە بۆ خەڵك ڕاسـت بکەیتـەوە، وە گیـانی عەزیـەتو زیرەکـیو گەشـبینی لـە نێـو مسـوڵمانان بچـێنی، بـەڵکو مسوڵمانان هۆشیار بینەوە، بۆ بینا کردنی عیـززەتو، بـەرپا کردنـی وەحـدەتو، هێنانەدیو درووست کردنی قەوارەیەك بۆ خۆیان، ئـەو کاتـە مسـوڵمانان دڵخـۆش دەبن بە سەرکەوتنی خوایی، وە خوای خاوەن عیززەتیش هەر کەسێكو کۆمـەڵێکی بیەوێ سەری دەخات.

## کۆتایی

لە کۆتاییدا گرنگترین ئەو سیفاتە دەروونیانەتان بیر دێنمەوە کە پێویستە بۆ هەر کەسێك کە کاری بانگخوازی دەکات، خۆی پێ بڕازێنێتەوە.

* **بە هۆی ئیمانی پتەوی بە خوا:** دەتوانێ خۆی بە ئازایەتیو ڕێزو هەست کردن بە چاودێریی خوا بڕازێنێتەوە، وە دەروونی خۆی ئامادە بکات بۆ شەهید بوونو گەیشتن بە بەهەشت.

* **وە بە هۆی نیاز پاکیی (ئیخلاص)ەوە:** بەرز دەبێتەوە بەسەر بەرژەوەندییو مەبەستی دیکەی غەیری خوا، وە بە هۆی ئیخلاصەوە کارەکانیان دەبێتە تەنها بۆ خوا.

* **وە بە هۆی جورئەتو چاو نەترسییەوە:** لە هەر شوێنێك بن حەقبێژ دەبن، لەبەر خواش لە لۆمەی لۆمەکاران ناترسن.

* **وە بەهۆی ئارام گرتنەوە:** خۆیان دەگرن لەسەر بەلاّو موصیبەتو پێشهاتە نەخوازراوەکان.

* **وە بەهۆی گەشبینیو ئومێدەوە:** بۆ مەیدانی بانگخوازیو تێکۆشان دەچن بە زەردەخەنەی ئومێدەوە، وە بە دەروونێکی خاوەن عیززەتەوە، بێ ئەوەی ڕەش بینی بتوانێ بەسەریاندا زاڵ بێ.

**مسوڵمانان چەندە پێویستیان بە بانگخوازانێکە خۆیان ڕازاندبێتەوە:**

بە ئیمانێکی قووڵو ڕۆچوو، بێ ئەملاو ئەولا کردنو سارد بوونەوە.

وە بە جورئەتو چاونەترسییەك حەقبێژێك بن ترسو دڵەڕاوکێ نەناسن.

وە بە ئارام گرتنێکی بەردەوام کە بێ تاقەتی‌و ماندوبوون نەناسێ.
وە بە ئومێدێکی پڕ لە زەردەخەنەوە کە هەرگیز ڕەش بینی‌و بێ ئومێدی‌و گەڕانەوە بۆ دواوە نەناسێ.
لە حەقیقەتدا ئەم پێنج سیفاتە دەروونیە لە تایبەتمەندی پیاوانێکە کە ڕاستگۆن لەگەڵ ئەو پەیمانەی بە خوایان داوە، وە لە سیفاتە جیاکەرەوەکانی ئەو بانگخوازانەیە کە بۆ گەیاندنی حەق لە لۆمەی لۆمەکاران ناترسن، وە لە گەیاندنی دینی خوادا لە غەیری خوا لە هیچ کەسی دیکە ناترسن، چونکە بنچینەی ئیمان‌و باوەڕ بوونی دڵێکی زیرەکە، وە بنچینەی ئیخلاص دڵێکی پاکە، وە بنچینەی جورئەت‌و چاونەترسیی بوونی هەست‌و شعورێکی بەهێزە، وە بنچینەی ئارام گرتن بوونی ئیرادەیەکی تاقەت پڕوکێنە، وە بنچینەی گەشبینی‌و ئومێدیش بوونی دەروونێکی خاوەن ئومێدە..
وە بوونی ئەو سیفەتانە بە هێزێکی زۆرەوە لە گەنجانێکی بانگخوازی ئیماندار نەبێ کۆنابێتەوە، ئەوانەی ئیمانیان هێناوە بە پەروەردگاریان، وە شانازیی بە ئیسلامەتییەکەیان دەکەن، لە پێناو بانگەوازییەکەیان دەردەچن، خوای پەروەردگاریش لەسەر دەستی ئەوان خێرو خۆشی فەراهەم دێنێ‌و، دەبنە جێگەی سوود بۆ ئۆممەتان..
لێرەوە دەبینین بانگخوازانی لای خوا پێشترو ئێستاش لە هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی مێژوو بوونەتە کۆڵەکەی ڕاپەڕینی ئۆممەتی ئیسلامیی، وە نهێنی هێزو پێزی ئەو ئۆممەتەن، وە بوونەتە سەرچاوەی شانازیی‌و ڕێز، وە هەڵگری ئاڵای ئەو ئۆممەتە بووینە، وە پێش خەڵکی کەوتوون بۆ سەرکەوتن‌و گەڕانەوەی ڕێزو پلەو پایە، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ

ٱقْتَدِهْ ... ﴿٩٠﴾ الأنعام، واتە: ئەوانە کەسانێك بوون خوا ڕێنموونیی کردن دەی پەیڕەوی ڕێگەو ڕێبازی ئەوان بکە.

لەسەر بانگخوازان پێویستە ئەگەر بیانەوێ ئۆمەتی ئیسلام بوونێکی سەربەرزانەی هەبێ، سەنگو قورسایی هەبێ، ڕێزو پێزی هەبێ، قەوارەیەکی بەهێزی هەبێ، دەبێ زۆر بەباشی دەرك بە بەرپرسیارێتیی بکەن، وە ئەو سیفاتە دەروونیانەش بناسنو بزانن کە پێویستە پێی وەصف بکرێن، وە خوای بەرزو بالآدەست دەسەلآتی بەسەر هەر شتێکدا دەشکێ کە فەرمانی پێکردوە، بەلآم زۆربەی خەلکی ئەمە نازانن.

نێوەڕۆك | لاپەڕە